# سەیرو سەمەرەکانی جیهان

دانەر: سهير سمور

و. لە عەرەبییەوە

مستەفا سەعید عەلی



لەبڵاوكراوەكانی خانەی چاپ و بڵاوكردنەوەی

Email \ cwarcra_slemani@yahoo.com
Mobile \ 1575067



فەرهەنگی سەیرو سەمەرەكانی جیهان

بابەت: فەرهەنگ

ئامادەكردنی: سوهێر سەمور

وەرگێڕانی: مستەفا سەعید عەلی

كۆمپیوتەر: راویز سەلام كەریم

ژمارەی سپاردن: (٧٦٨ ) ساڵی ( ٢٠٠٥ )

چاپی یەكەم - سلێمانی

٢٠٠٥

# زۆرترین پەنجەی دەست

زۆرترین پەنجەی دەست پەنجەکانی ئەو منداڵە بوو کە لەنەخۆشخانەی قەشە جۆرج لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا هاتوەتەدنیاوە، دەستەکانی (١٤) پەنجەو قاچەکانی (١٢) پەنجەیان هەبوو، ئەمەش زۆرترین چەنجەیە کە تا ئێستا لەدەستو قاچی مرۆڤدا تۆمارکرابێت.

# درێژترین نینۆك

*ڕۆمنس شارما* کە هاولاتییەکی هندییە، خاوەنی درێژترین نینۆکە لەجیهاندا کە دەگاتە (٦٤,٤٤)سەنتیمەتر.. لەماوەی سیانزە ساڵدا درێژترین پەنجەی نینۆکی دەستی چەپ نینۆکەکانی دەستی چەپی هاولاتی *شیرهاردی* هیندییە کە لەماوەی (١٩٥٢) بۆ (١٩٧٩) نەیقرتاندوەو درێژییەکەی گەیشتوەتە (٢٤٣,٩٥)سەنتیمەتر.

# درێژترین سمێڵ

سمێڵی *ماشور هێ رانی* هندستانی درێژترین سمێڵە، *ماشور* لەچینی ئەرستۆکراتی هیندستانی ساڵی (١٩٠٨) لەدایکبووە، ئەم پیاوە لەنێوان ساڵەکانی (١٩٤٩) بۆ (١٩٦٢)دا سمێڵی هێشتەوەو لەو ماوەدا درێژی سمێڵی گەیشتوەتە (٢٥٩)سەنتیمەتر.

## درێژترین قژ

درێژترین قژ لەجیهاندا قژی *سوامی بەندراساندی* سەرۆکی دێری تیرواد تواری هیندستانە، کە ساڵی (١٩٤٩) درێژییەکەی گەیشتوەتە (٧٩٢,٤٥)سەنتیمەتر.

## درێژترین ریش

درێژترین ریش لەجیهاندا کە تا ئێستاش پارێزراوە ریشی *هانس لانغیسی* نەرویژییە کە درێژییەکەی (٥٢٣)سەنتیمەتر.

## درێژترین چەناگە

*هانز لانجزتی* بەرەگەز بەریتانی بەخاوەن درێژترین چەناگە دادەنرێت لەجیهاندا، چەناگەی هانز درێژییەکەی (١٧,٥)سەنتیمەتر.

## درێژترین قژ

*ماری ئۆدێل لرفێر* کە خانمێکی فەرەنسییە، بووەتە خاوەن درێژترین قژ لەجیهانداو ئەم دیاریکردنەش لەئۆلۆمپیاتی ساڵی (١٩٨١) بوو، ئەو کات قژی ماری (٣٣٠)سەنتیمەتر بوو.

# قەبەترین پیاو

لەویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا دوو برا هەن کە بەدووانە لەدایك بوون، ئەم دوو برا، دوو خوشکی دووانەیان هێناوە.. لەکاتی سواربونی فرۆکەدا هەریەکەیان لانیکەم جێگەی سێ کەس، واتە سێ کورسی دەگرن‌و کارمەندانی فرۆکەکە هەمیشە داوایان لێدەکەن کە هەریەکەیان لەلایەکی فرۆکەکەوە دابنیش بەمەبەستی هاوسەنگ بوونی.. قورسایی هەریەکەیان زیاتر (٢٥٠)کیلۆیەو، لەگەڵ ئەوەشدا دوو مرۆڤی زۆر رۆح سوکن‌و هەمیشە سەرقاڵی یاری وەرزشن بەتایبەتی یارییەکانی ماتۆڕسواریی‌و پاڵەوانبازیی.

# بەرزترین باڵا

پێش ماوەیەك لەشاری نیویۆرکی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا پیاوێکی باڵا بەرزی ئەوتۆ دەرکەوت کە لەبەر باڵا بەرزەکەی ناچار دەبوو لەکاتی سەرکەوتنی ئۆتۆمبیلەکەیدا سەقفەکەی لابەرێت.. لەباڵا بەرزەکانی تریش ئەوانەی ناویان لەمێژودا تۆمارکراوە؛ هاوڵاتییەکی روسییە بەناوی *ماشتۆخی* کە بەدرێژترین مرۆڤی سەردەم دادەنرێت لەبەرئەوەی بەرزی باڵاکەی گەیشتە (٢٨٥)سەنتیمەتر.. هەروەها هاوڵاتی *رۆبەرت وادلۆ* بەدرێژترین پیاوی جیهان دادەنرێت، *رۆبەرت* رۆژی ٢٢ شوباتی ١٩١٨ لەدایك بووە تا تەمەنی دوو ساڵی کێشی گەیشتوەتە (٢٢,٥٦)کیلۆو هێشتا درێژییەکی ئاسایی هەبووە، ئینجا گۆڕانکارییەکی کتوپڕ لەژیانیدا رویداو بەشێوەیەکی

جیهان

چاوەڕواننەکراو دایە بەرزبوون بەجۆرێك لەتەمەنی (٢٢) ساڵیدا بەرزی باڵای گەیشتە (٢٧٢,٤)سەنتیمەتر.

## چوار چاو

ئەمە لەوڵاتی چین رویداوە، هاوڵاتییەك لەچین بەچوار چاوی ئاساییەوە لەدایك بوو، ئەو مرۆڤە دانسقەیە ناوی *لیۆ شۆنگ* بووەو هەندێکجار ب*ەلیۆمین* بانگیان دەکرد.. *لیۆ شۆنگ* بەهەر چوار چاوەکەی دەیبینیو هاوڵاتییەکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو فەرمانڕەوای هەرێمی شانسی وڵاتی چین بووەو دواتر بووەتە وەزیرو زۆر حەزی لەخواردنەوەو قومارکردن بووە.

## بیستن بەدەم

منداڵێك لەیۆنان بەبێ گوێچکە لەدایك بوو، منداڵە بێ گوێچکەکە ناوی *حزقیال ئایدزی* لێنرا.. ئەم منداڵە هەرکاتێك بیویستایە گوێ لەقسەی کەسێك بێت دەمی دەکردەوەو بەمشێوە گوێی لەقسەکانی دەبوو، کاتێك گەورە بوو بۆ نیشوکارکردن سەفەری نیویۆرك کردو لەوێ ماوە تا ساڵی (١٨٨٤) مرد.

## قورسترین پیاو

*رۆبەرت ریدل هۆمز* کە گەنجێکی رۆح سوکە بەقورسترین مرۆڤی سەر گۆی زەوی دادەنرێت، ئەمەش لەبەرئەوەی کێشی گەیشتوەتە (١٠٦٩)رەتڵ.

## منداڵی دوو سەرە

لەنەخۆشخانەی جەریسکسریش کە لەولاتی نەمسایە، رۆژی ٢٢ تشرینی دووەمی ١٩٨١ منداڵێکی دوو سەر لەدایك بوو، منداڵەکە تەنیا یەك کاتژمێر لەژیاندا مایەوەو ئینجا لەنەخۆشخانەکەدا مرد.

بەگوێرەی رۆژنامەکانی نەمسا: منداڵەکە دوو بڕبڕەی پشتی هەبووەو درێژییەکەی (٣٤)سەنتیمەترو کێشی (٢,٧٠)کیلۆگەرام بووە، بەهەمانشێوە لەهەرێمی کەراچی پاکستان منداڵێك بەدوو سەرەوە لەدایك بوو، ئەم منداڵەیان ماوەی سێ رۆژ ژیا.

## بلیمەتترین منداڵ

بەناوبانگترین منداڵ کە جیهانی سەرسام کردبێت منداڵێکی ئەمریکییە بەناوی *سیدلیس، بۆریس*، باوکی ئەم منداڵە مامۆستای زانکۆی هارفۆرد بوو.. *سیدلیس* لەتەمەنی شەش مانگیدا پیتەکانی زمانی لەبەرکردو لەتەمەنێکدا کە هیچ منداڵێك توانای قسەکردنی نییە، پیتەکانی لەبەر دەخوێندەوەو، کاتێك گەیشتە تەمەنی (١١)ساڵی چووە زانکۆی هارفۆردو لەوردترین مەسەلەکانی زانستدا وتووێژی لەگەڵ مامۆستاکانی ئەو زانکۆیە دەکرد.

# مردوی زیندوو

سـاڵی (١٨٢٧) زانـا *جێرمـی بنتـام* نەخۆشـخانەی کۆلێـژی پزیـشکی لەلەندەن دامەزراند، پێش مردنی لەساڵی (١٩٣٢)دا وەسیەتی کـرد کـە پاش مردنـی هـەموو سـامانەکەی بدرێتـە نەخۆشـخانەی نـاوبراو بەمـەرجێك بەسـەرۆکی رێگەپێـدراوی ئەنجومـەنی بـەڕێوەبردن لەنەخۆشـخانەکە بمێنێتەوەو لەکۆبونەوەکاندا بەشداری بەو پەیکەرە بکرێت کە هی ئەمەو، بەجلوبەرگەکانییەوە لەسەر کورسی سەرۆك دابنرێت، لەساڵی (١٩٣٥)ەوە ئەم وەسێتە سـەیرە جێبەجێـدەکرێتو پەیکەرەکـەی *بنتـام* لەجێگـەی سـەرۆك دادەنرێـتو لەکۆبونـەوەی سـاڵانەدا کاتێـك کۆبونەوەکـە بـەو جـۆرە بەڕێوەدەچێت یـەکێك لەئەندامـەکان دەڵێت سـەرۆك ئامـادەی کۆبونەوەکە بوو، بەڵام دەنگ نادات.

*بنتام* مرۆڤێکی دانـسقە بـوو، لەتەمـەنی پێـنج سـاڵیدا بێجگـە لـەزمانی ئینگلیزیـی بەزمانـەکانی لاتینـیو فەرەنـسیو یۆنـانی قـسەی دەکـردو، ئـەو کاتـەی کۆلێـژی ئۆکسفۆردی بـەناوبانگی تـەواوکرد هێـشتا تەمـەنی سیانزە ساڵی تێنەپەڕانـدبوو.. کـاتێکیش تەمـەنی گەیـشتە پـانزە سـاڵ لێنسانـسی لەئەدەبیاتدا وەرگـرت، دوای ئـەو تەمەنـەش چووە دنیـای ئـەدەبو زانـستو فەلـسەفەو ناوبانگییەکـەی سـنورەکانی بـەریتانیاو ئـەوروپای تێپەڕانـدو گەیشتە ئەمەریکا.

## گوێچکەی هەڵدەگەڕێنێتەوە

لەژیاندا زۆر کەس هەن کە دەتوانن جوڵەی سەیرو سەمەرە بەیەکێك لەئەندامەکانی لەشیان بکەن، بەڵام کەسیان وەك *ماری لویزی* هاوسەری *ناپلیۆن* نین کە دەیتوانی هەر کاتێك بیویستایە بەشێوەیەکی زۆر سەیر گوێچکەکانی هەلگەڕێنێتەوە.. *ناپلیۆن* زۆری حەز بەبینینی ئەم دیمەنە دەکردو، زۆرجار پیاوانی کۆشکی کۆدەکردەوەو داوایدەکرد کە *ماری* ئەو جولانەیان بۆ بکات.

ئەم زانیارییانە لەنوسینەکانی *دالێرای* گەورە ئەمینداری کۆشکی فەرەنسیدا تۆمارکراوە.

## سێ مانگ چاو نوقاندن

لەسەردەمی دێریندا سزا بەسەر ئەو ئەندامەی لەشدا دەدرا کە تاوانەکەی پێ ئەنجامدرابوو، ئەمە دابونەریتێکی کۆنەو لەسەردەمی هاوچەرخیشدا هەمان سزا دوبارە کراوەتەوە، بەڵام بەجۆرێکی تر.. لەئەڵمانیا پیاوێك بەناوی *ئەلبەر هنیرسۆن لاوفەر* حەزی لەخێزانی هاوڕێکەی کردبوو، بەحەزو تامەزرۆییەکی زۆرەوە لێی دەڕوانی، بەجۆرێك پاش ماوەیەك هەستی بەخۆی کردو ویژدانی ئازاری دەدا، هات سەرەتا مەسەلەکەی لەلای هاوڕێکەی، واتە مێردی ژنەکە باس کردو بەمەشەوە

جیهان

ئەودستاو مەسەلەکەی بردە بەردەم دادگا بەو تۆمەتەی گوایە خیانەتی کردوه..

لەکاتی رۆشتنە دادگادا بوو کاتێك قەشەیەك هاتە ناو مەسەلەکەودو پێکەوە لەگەڵ *ئەلهرو* مێردی ژنەدا رێکەوتن لەسەر ئەوەی کە مەسەلەکە نەبرێتە بەردەم دادگاو لەبەرئەوەی کە تاوانەکە بەچاو ئەنجامدراوە کابرای قەشە فەرمانی دەرکرد تاوانبار بۆ سێ مانگ چاوی راستی کە وردتر لەچاوی چەپ دەبینێت، بنوقێنێت بەبێ ئەوەی شت بخاتە سەری یان بیبەستێت.. کابرای داماو بەناچاری چووە ژێر باری سزاکەو بۆ سێ مانگ چاوی راستی نوقاندو مێردی ژنەکەش بەوردی چاودێری جێبەجێبونی سزاکەی دەکرد.

## بلیمەتەکانی خوار سیساڵ

!.. گەنجێک کە تەمەنی (٢٢) ساڵ بوو، کاتێك لەزانکۆوە پاش بەدەستهێنانی پلەیەکی زانستی بۆماڵەوە دەگەڕایەوە بیردۆزەیەکی گرنگی دۆزییەوە، گەنجەکە ناوی *ئیسحاق نیوتن* بوو.

!.. *شکسپیر* لەتەمەنی (٢٧) ساڵیدا ناوبانگی دەرکردو کاتێك گەیشتە تەمەنی (٣٠) ساڵ شانۆنوسێکی زۆر بەناوبانگی لێدەرچوو.

سەیرو سەمەردکانی............

!.. *سەڵاحەدینی ئەیوبی* گەنجێکی تازە پێگەیشتبوو کاتێك (**العاصد**) دوایین خەلیفەی فاتمییەکان بەسەرکردە هەڵیبژارد، سەرەتا لەبەر کەمی تەمەن سوپای سوریا نەچونە ژێر فەرمانداریییەوە، بەلام بەدانایی‌و نەرمونیانی توانی سوپاکەی سوریاش رازیبکات بەگەورەی خۆیان قبوڵی بکەن.

بێجگە لەمانە گەنجان‌و منداڵانێکی زۆر رەورەوەی مێژوییان گۆڕییەوەو بوونەتە هۆکاری چەندین روداوی گەورەو کودەتا:

!.. ئەو خوێندکارە گەنجەی کە شازادەی نەمساو دەستگیرانەکەی کوشت هۆکاری جەنگێکی گەورە بوو..

!.. ئەو گەنجەش کە لەپاریس *لویسی شانزەو ئەنتوانێت*ی بینی بەرەو فارن هەڵدەهاتن، پێش ئەوان خۆی گەیاندە فارن‌و شۆڕشگێرانی لێ ئاگادارکردنەوەو دەستگیرییان کردن..

!.. خوێندکارێکی بچوك سوپای ئەڵمانیای لەجەنگی هەفتادا تێوەگلاند، تائێستا زۆرێك لەنوسەرو شاعیران دەربارەی ئەم خوێندکارە منداڵەیان نوسیوە.

جیهان

## بلیمەتەکانی خوار چل ساڵ

❗.. *ئیسحاق نیوتن* پێش گەیشتنە تەمەنی (٢٥) ساڵ هەندێك لەبیردۆزە بەبایەخەکانی دارشتبوو.

❗.. *لێتسی* شاعیر لەتەمەنی (٢٥) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

❗.. *مارتن لۆسەر* کاتێك بەریفۆرمخوازێکی ئایینی ناوبانگی دەرکرد، هێشتا لەتەمەنی (٢٥) ساڵیدا بووە.

❗.. *گۆتە* لەتەمەنی (١٢) ساڵیدا رۆڵی دەبینی.

## ئەو بلیمەتانەی تا پیری ژیان

❗.. *هۆمیرۆش* لەپیریدا هۆمیرۆسی نوسی.

❗.. *ئەبو عەلای مەعری* لەکەنفتەییدا لزوماتی نوسی.

❗.. *دانیال دیفۆ* لەتەمەنی (٦٠) ساڵیدا چیرۆکی رۆنبسۆن کرۆزی نوسی.

!.. *ئەفلاتۆن* بەماوەیەکی کەم پێش مردنی لەتەمەنی هەشتاو یەك ساڵیدا باشترین کتێبی نوسی.

!.. *جاحزو شەدیاق* لەتەمەنی (٩٠) ساڵیدا سەرقاڵی نوسینی کتێب بوون.

!.. *برنادشۆ* لەنەوەدەکانی تەمەنیدا هێشتا بەگورجو گۆڵی دەینوسی.

## یەکەمەکان

!.. یەکەمین گەل دنیامیتی ناسیبێتو ئاگری دابێت چینییەکان بوون، هەر چینییەکان بوون نواندنو رۆژنامەی رۆژانەو کاغەزی دراویان لەجێگەی پارەو دیاریکەری ئاراستەیان داهێنا.

!.. یەکەم وڵات ژنی لەبواری پۆستەو گەیاندندا بەکارهێنابێت وڵاتی فەرەنسا بوو.

!.. یەکەم کەس کە بانکی دامەزراند پیاوێکی سویدی بوو بەناوی *بلمسترۆك*.

جیهان

!.. یەکەم تیمی ئاگرکوژێنەوە لە(١٠٠ پ . ز ) لەرۆماو لەلایەن *لینۆس کراسۆس* کە هاوڵاتییەکی جولەکەیە دامەزرا.

!.. یەکەم پزیشکی عەرەب *ئەبو بەکری رازی*یە کە لەسەدەکانی سێیەمو چوارەمی کۆچیدا لەشاری بەغدا ژیاوەو زیاتر لە(١٠٠) کتێبی لەبواری پزیشکیدا داناوە بەناوبانگترینیان کتێبی (الحاوی)یە کە لەبیست و یەك بەرگدایە.

!.. یەکەم پزیشکی ددان لەجیهاندا *بیار فۆشاردی* فەرەنسییە لەساڵی (١٧٢٨) کتێبێکی بەناوی نەشتەرگەریی پزیشکی ددان بەچاپگەیاند کە بەکلیلی زانستی پزیشکی ددان دادەنرێت.

## لێکچووەکانی ناپلیۆنو محەمەد عەلی پاشا

!.. *ناپلیۆنو محەمەد عەلی* پاشا هەردوکیان ساڵی (١٧٦٩) لەدایك بوون.

!.. *ناپلیۆن* لەشارێکی سەر کەنار دەریای سپی لەدورگەی کۆرسیکا لەدایکبووە، هەروەها پاشا *محەمەد عەلی* لەشارێکی کەنار دەریای سپی بەناوی قەواله لەئەلبانیا لەداکبووە.

سەیرو سەمەرەكانی..........................................

!.. ژنی یەكەمی *ناپلیۆن جۆزەفین* بێوەژن بووە، بەهەمانشێوە ژنی یەكەمی *محەمەد عەلی* پاشا كە ناوی *ئامینەیە* بێوەژن بووە.

!.. *جۆزەفین* ژنی *ناپلیۆن* مندالّی نەدەبوو، هەروەها یەكێك لەژنەكانی *محەمەد عەلی* پاشا نەزۆك بووەو مندالّی نەبووە.

!.. سالّی (١٧٨٩) *ناپلیۆن* ئینگلیزەكانی لەئەسكەندەریە دەركرد، *محەمەد عەلی* پاشا بەهەمانشێوە سالّی (١٨٠٧) ئەسكەندەریەی لەئینگلیزەكان ئازادكرد.

!.. *ناپلیۆن* یەكەم كەس بوو كشتوكالّی لۆكەی بردەوە بۆ فەرەنسا، هەروەها پاشا *محەمەد عەلی* یەكەم كەس بووە تۆوی لۆكەی لەسیلانەوە هێنایە میسر.

!.. *ناپلیۆن* یەكەم كەس بوو بانكی لەفەرەنسا دامەزراند، *محەمەد عەلی* پاشاش یەكەم دامەزرێنەری بانكە لەولاّتی میسر.

!.. هەریەك *لەناپلیۆن*و *محەمەد عەلی* وەكیەك فەرمانی ئازادكردنی كۆیلەیان دەركرد.

## زۆرترین منداڵ

ژنی یەکەمی *فیدوفا سیلیف* روسی ٦٩ منداڵی هێناوە *فاسیلیف* جوتیارێکی روسیە خەڵکی شوبایە کە دەکەوێتە (٢٥٣) کیلۆمەتر خۆرهەڵاتی مۆسکۆ، لەبیست و حەوت سك:

!.. شازدەیان دوانە بوون (١٦ × ٢ = ٣٢ منداڵ).

!.. حەوت سکیش سیانە بوون (٧ × ٣ = ٢١ منداڵ).

!.. چوار سکیش چوارە بوون (٤ × ٤ = ١٦ منداڵ).

هەموویان لە نێوان ساڵانی (١٧٢٥ — ١٧٦٥)دا لەدایکبوون، لە ئەو منداڵانە تەنیا دوانیان مردن و ٦٧ یان تا هەژدە ساڵی مانەوە.

## زۆرترین منداڵبوون

دکتۆر (جینارۆ مۆنتانینو) لە رۆماوە رایگەیاند: لەسکی ژنێکی تەمەن سی و پێنج ساڵەدا بەیەکجار (١٥) منداڵی دەرهێناوە. لەو منداڵانە (١٠) یان کچ و (٥)کەی تریان کوڕ بوون، بەبڕوای دکتۆر مۆنتانینۆ هۆکاری ئەم حاڵەتە بۆ خواردنی دەرمانی جۆراوجۆر دەگەڕێتەوە لەلایەن دایکیانەوە.

# گەورەترین دوانە ( جمك )

!.. ئەو (١٠) جمکە بوون کە پێکەوە (دوو کوڕو هەشت کچ) لە(٢٢ نیسانی ١٩٢٤) لەوڵاتی بەرازیل هاتنە دنیاوە.

!.. گەورەترین جمکیش کە لەلایەن پزیشکانەوە ڕاگەیەنرا بێت ئەو نۆ منداڵە بوون (پێنج نێرو چوار مێ) کە لەنەخۆشخانەی سیدنی ئوستورالیا خاتوو (*جیرالین*) هێنانی.

# قورسترین دوانە

!.. قورسترین پێنج جمك کە کێشی هەموویان (١١,٣٣٧) کیلۆ گرام بوو لەوڵاتی چین و لەبەرواری (٧ حوزەیرانی ١٩٥٣) خاتوو *لۆی سولین* هێنانی.

!.. قورسترین چوار جمك بیرکرست هێنانی لە نەخۆشخانەی مۆناکۆ، کە کێشیان (٤,٢٥٤) کیلۆ گرام بوو.

!.. قورسترین سێ جمك کە بەهەموویانەوە کێشیان گەیشتە (١١,٨٦١) کیلۆ گرام ، ئەم سێ جمکە منداڵی ژنێکی ئێرانی بوو.

!.. قورسترین دوو جمك كێشیان دەگەیشتە (١٦,١٦٨) كیلۆ گرام قورسایی یەكێكیان (٨,٠٠٥) كیلۆگرام و ئەویتریان (٨,١٦٣) كیلۆگرام بوو.

## قورسترین جمك

قورسترین دوانەی جیهان لەویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمەریكادان بەناوەكانی *بیللی*و *بینی مەكاری* كە كێشی هەریەكەیان دەگاتە (٧٠٠) ڕەتڵ.

## درێژترین جمك

درێژترین دوانە لەجیهاندا هەردوو برا (*دا بوسچی*و *دوج بۆدیش*) بوون كە لەویلایەتی ئەریزۆنای باكوری ئەمەریكا لەدایكبوون درێژی هەردووكیان ١٩٧سەنتیمەتر بوو.

## قورسترین منداڵ

!.. خاتوو *ئەناباتیس* لەبەرواری (٢٢ مارتی ١٨٩٧)دا منداڵێكی بوو، قورسی منداڵەكە گەیشتە (١٠,٧٧٠) كیلۆ گرام.

⁂.. هــــەوروەها لـــەئاياری ســـاڵی (١٩٣٩)دا منـــداڵێکی کەمئەنـــدام هاتـــەدنياوە کـــە کێـــشەکەی (١٢,٣٧٧) کیلـــۆ گـــرام بـــوو، منداڵـــە کەمئەندامەکە تەنیا دوو سەعات لەژیاندا بوو.

## منداڵێکی بێ چاو

ئەم ڕووداوە لـە شـاری سابلوتـسۆی فەرەنـسا ڕوویـدا منـداڵێکی بـێ چاو لەدایکبوو، ئەم منداڵە شەش براو خوشـکی تـری هـەبوو هـەموويان چاويان تەواو بوو.

## ژن و پیاوێك لەلاشەیەکدا

لەیـــەکێك لــە لادێکـانی وڵاتــی یەمــەن منــداڵێك لــەدايکبوو. نيـوەی خوارەوەی لەشـی ئەم منداڵە کچ بوو، نیوەکـەی سەرەوەشـی بريتيبـوو لـەدوو لاشـەی پێکـەوە نوسـاو کـە دوو سـەرو دوو دەمو چـاوو چـوار دەسـتيان هــەبوو، ئــەم منداڵــە گــەورە بــوو گەيــشتە تەمــەنی لاوی، هەردووکیان خواردنو خواردنەوەيان جودا بوو، بەڵام لەبەشـی خـوارەوە لەیەك دەرچەوە پاشەڕۆيان فڕێدەدا.

## منداڵێکی ترسناك

لەنەخۆشخانەی ریترۆی شاری نیگاراکوای فەنزەوێلا منداڵێکیان لەسکی ئافرەتێك دەرکرد کە تەنیا یەك چاوی هەبوو، ئەویش لەناوەراستی نێوچەوانیدا بوو.. ئەم منداڵە لوتی نەبوو، چاوی چوار گۆشە بوو، تەنیا یەك کاتژمێر ماتەوە، دواتر گیانی لەدەستداوە، سەیرەکە لەوەدایە دایکی ئەو منداڵەکە بەناوی *ترانا* کە ژنەجوتیارێك بووە، لەگەڵ شەش منداڵەکەی تریدا ژیانێکی زۆر ئاسایی بەسەر دەبردو، تەنیا ئەو یەك کاتژمێر نەخۆشخانەی بینیوە کە ئەو منداڵە سەیرەی لەدایکبووە..

لاشەی منداڵەکە لەو نەخۆشخانەی ناوبراودا بەپارێزراوی مایەوە تا ئەو کاتەی پزیشکەکانی توێکاری لێکۆڵینەوەی پێویستیان لەسەر کرد، چونکە ئەو روداوە رەنگە لەدونیادا تەنیا یەکجار رووبدات.

## منداڵی پیر

لەشاری دیزلاندی کالیفۆرنیا دوو منداڵ لەدایکبوون تووشی نەخۆشی (پیری سویر) هاتبوون، ئەم نەخۆشیە، واتە نەخۆشی پیری سویر لەهەر هەشت ملیۆن کەس توشی یەك کەس دەبێت و بریتییە لەدەرکەوتنی نیشانەکانی پیری لەدەمو·چاوی ئەو منداڵەدا، ئەو

منداڵـەی کـە توشـی ئـەم نەخۆشـییە دەبێـت لەتەمـەنی دە سـاڵیدا لـە پیاوێکی شەست ساڵی دەچێت.

## منداڵ لەئەستێرەیەکی ترەوە

چـەند جوتیارێـك کـە لەکێڵگەکـەی خۆیانـدا بـۆ پشودان و حەوانـەوە دانیـــشتبوون لـــەناکاو دوو منـــداڵ لەبەردەمیانـــدا قوتبوونـــەوە کـــە لەئەشـکەوتێکی نزیـك کێڵگەکەیانـەوە هـاتبوون.ئەو منداڵـە کـە واقیـان لەدیتنی جوتیارەکان رومابوو هەر دەگریان، منداڵەکان زۆر سەیر بوون: رەنگی رومەتیان سەوزی تێر بوو.

لەراسـتیدا شـتی وا نامۆیـەو هـیچ تەفسیرێکی نییـە، بـەڵام پیـاوانی لێکۆڵەری رۆحی ئەم دیاردە بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە کە گوایـە جیهـانێکی تـر هەیـە بـەناوی جیهـانی چـوارەم.. هەنـدێك لـەو لێکۆڵـەرە رۆحییانـە وتویانە ئەو دوو منداڵـە بەهەڵـە کەوتونەتـە خـوارەوە بۆ ئەم جیهانەی خۆمان و کەوتنـە خوارەوەکـەیان بەرێگەیـەك بـووە کـە تائێـستا نـەزانراوە چۆنە!

هەنـدێکیتر پێیانوایـە: ئـەو دوو منداڵـە لەبۆشـاییەکی گەردونـەوە کەوتونەتـە سـەر گـۆی زەوی، ئەم لێکۆڵەرانە نمویـەك بـۆ رونکردنـەوەی باسـەکەیان دەهێننـەوە" وەك چـۆن کەسـێك بەسـەر بەسـتەڵەکی سـەر دەریادا دەچێت و لەپڕ لـە کونێکـەوە دەکەوێتـە خوارەوەو ناتوانێـت ئـەو

کونە بدۆزێتەوەو لێی بێتە دەرەوەو بگەرێتەوە. ئەمانیش بەهەمانشێوە کەوتونەت سەر زەوی.

کاتێك جوتیارەکان چەندین جۆر خواردنیان لەبەر دەستی ئەو دوو منداڵەدا دانا، کەچی لێیان نەخواردو تەنیا نانی وشكو ئەو میوەیان دەخوارد کە لەبەردەستیاندا بوو.

راپۆرتێك کە لەم بارەوە ئەنجامدراوە ئاماژە بەوەدەکات کە رۆژێك جوتیارەکان لەکێڵگەکانیان دەگەرانەوە بۆ ماڵەوە هەندێك فاسۆلیایان بەلقەکانیەوە هێنابووە، کاتێك منداڵەکان چاویان بەفاسۆلیاکە کەوت پەلاماریان داو بەتامو چێژێکی تایبەتەوە دەیانخوارد، یەکێك لەمنداڵەکان لەئاکامی زۆر خواردنەوە دوای ماوەیەکی کەم گیانی لەدەستدا.

منداڵەکەی تریان گەشەیکردو بووە خزمەتکار لەماڵی *دی کانۆ* کەیەکێك بوو لەجوتیارەکانی گوندەکە بوو، پاش ئەو ماوەیە رەنگە سەوزە تێرەکەی گۆرا بۆ سەوزی کاڵ، دوای مانگێك وردە وردە فێری هەندێك وشە بوو، تاوای لێهات دەیتوانی باس لەو جیهانە بکات کە لێوەی هاتووە، بەڵام قسەکانی لەم بارەوە کارەکەی ئاڵۆزتر کرد، وتی لەوڵاتێکەوە هاتووە کە هەرگیز خۆری لێ هەڵنایەت، سەبارەت بەچۆنێتی هاتنە سەر زەویش وتی: دەنگەدەنگو هەراو هوریایەکی زۆر بەهێز بوو وای لێکردین بکەوینە ئەم جیهانەوەو ئەوەبوو خۆمانمان لەو کێڵگەیەدا دیتەوە.

جیهان

منداڵی دووەم پێنج ساڵ لە ماڵی *دی کانۆ* مایەوەو ئینجا گیانی لەدەستداو لە تەنیشت براکەیدا نێژرا.

هێشتا لەگەڵ ئەوەشدا بەسەرهاتی ئەو دوو منداڵە سەوزە بەئاڵۆزی و بێ چارەسەر مایەوە.

## نامۆترین لەدایکبون

لەشاری لازقیەی سوریا ژنێکی سەرو تەمەن چل ساڵ منداڵێکی سەیری بوو، منداڵەکەی لەسەگی ئاوی دەچوو، تەندروستی زۆر باش بوو، ئەو ژنە پێش ئەم منداڵە حەوت منداڵی تری بەشێوەیەکی ئاسایی بوو، پسپۆڕان رودانی ئەو حاڵەتە دەگەڕێنەوە بۆ دەرمان خواردنی جۆراو جۆر.

## تەمەنی حەوت ساڵەو دوو مەترو نیو درێژە

*ماریا فیلدا* درێـژترین ژنـە کـە لەمێـژوودا بـاس کرابێـت، *ماریا فیـدا* درێژییەکەی گەیشتوەتە (٢٥٥) سـەنتیمەتر، ئەمـە ئەوکاتانـە کـە لەتەمـەنی حەوت ساڵیدا لەبەرلین کۆچی دوایی کرد.

## درێژییەکەی . . .دوو بستە

کورتترین ئافرەت ژنێکی تەمەن چلو پێنج ساڵە بـەناوی *زوبەیدە*، بـاڵای *زوبەیدەی* تەمەن چلو پێنج ساڵو بەڕەگەز لوبنانی تەنیا دوو بستە.

## دایکی ( ٢٨ ) کوڕ

*ماسیۆس بەربەری* ژنە جوتیاری یوگوسلاڤ تەمـەن بیـستو هەشـت سـاڵ لەسەریەك بیستو یەك کوڕی هێنایـە دنیـاوە، کوڕەکـانی *ماسـیۆس* تائێـستا لەژیاندا ماون.

## زەواجی ژمارە ( ٢١ )

................................................................. جیهان

*هیرد نجس* لەرۆما شووی بەپیاوێك كـرد كە پـێش ئـەم بیـست ژنـی تـری هێنابوو، ئـەم بـووە ژنـی بیـست و یەكـەمی، جێـی ئاماژەیـە *هـیرد نجسیـ*ش بیستو یەكەمین جار بوو شوو بكات.

## بەدوو زمانەوە، لاڵە!

بێگومـان بەدبـەختترین كەسـی جیهـان ئافرەتێكـە بـەناوی *فرانكفـورت فـرولینەوە*، *فـرۆلین* سـەرەڕای ئـەوەی لـەناو دەمیـدا دوو زمـان هەیـە، لەبەرئەوەی كە لاڵە ناتوانێت تەنیا پیتێك چییە بەزوبانی بدركێنێت....

## بۆ ئەوەی نهێنییەكە ئاشكرا نەكات

*لیۆنـی ئـەتیمنس* ئـەو ژنـە بـوو كە زمـانی خـۆی قرتانـد لـەپێناو ئـەوەی نهێنییەكانی پیلانی نێوان *هێومۆدلیسو ئەرستوجینوس* نەدركێنێت. بۆ رێزلێنـان لـەو فیداكارییـەی *لیـۆنی* لەیـەكێك لەشـەقامەكانی ئەسـینادا پەیكەرێكیان بۆ دروستكردووە.

## زیندوبونەوە

رۆژی (١٥ ی كانونی یەكەمی ١٩٨٧) پزیـشكەكانی نەخۆشخانەی چـنگ دی لـەولاتی چـین توانیـان گیـانی ژنـە جوتیـارێكی تەمـەن بیـستو چـوار سـاڵ

لەمردن رزگار بکەن دوای ئەوەی بۆ ماوەی هەشتاو شەش دەقیقە دڵی لەلێدان کەوتبوو.

٢٩

## ساڵ سەری مێردەکەی پاراست

*ئێلزابیس داڵی* سەری مێردەکەی بەمۆمیاکراوی بۆ ماوەی بیستو نۆ ساڵ پاراست، واتە دوای مردنی خۆیشی.

## مێشکێکی بەهێز

*لۆسیل نۆلان* کارمەندی فەرمانگەی تەلەفۆنات لەویلایەتی سان فرانیسکۆ توانی دوو هەزار ژمارەی تەلەفۆنی بەشداربوان لەبەربکات.

## خۆشەویستیو زەواج لەخەودا

*جون هیلۆری* کە جوتیارێکی دانیشتوی ناوچەی سوهامی بەریتانیایە، کەوتە داوی خۆشەویستیەوە، چۆن؟.. *جۆن هیلۆری* لەخەودا کچێکی بینیو هەر لەخەوەکەیدا عاشقی بوو، دوای دە مانگ لەگەڕان بەشوێنی ئەو کچەدا ناکام دۆزییەوەو زەواجی لەگەڵ کرد.. *جۆن*و هاوسەرەکەی بۆ ماوەی چل ساڵ پێکەوە ژیان تا لەساڵی (١٩٤٦) کۆچی دوایی کرد.

## بێ مێرد نەبوو

ئافرەتێک کە خەڵکی شاری هامبورگی ئەڵمانیا هاوکات لەگەڵ ئەوەی هەواڵی مردنی مێردی دووەمیان پێراگەیاند، مێردی یەکەمی گەڕایەوە دوای ئەوەی لەساڵی (١٩١٧)وە بێسەرو شوێن بوبوو، مێردی یەکەمی (٣٠) ساڵی لەسیبریا بەسەربرد بوو، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای خێزانەکەی.

## مەمکەکانی لە پشتەوە بوون

*ماجدو لینا سترو مرزوک* کە خەڵکی توپولسکی روسیایە، مەمکەکانی لە پشتەوە بوون هەرسێ منداڵەکەی بەو جۆرە شیر دەدا، ئەم حاڵەتە سەرسوڕهێنەرە دکتۆر *لینا ترویکر* بۆمانی دەگێڕێتەوە کاتێک ساڵی (١٩١٠) خۆی پزیشکی ئەو ئافرەتە بووە.

## سەلماندنی خۆشەویستی

*ڤان کوخ*ی وێنەکێشی بەناوبانگی فیلەندی لەسەر داوای خۆشەویستەکەی گوێی خۆی بڕیو بەدیاری پێشکەشیکرد بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە بەڕاستی خۆشی دەوێت.

## ژنێکی بێ گوێچکە.. زۆرتری دەبیست

خاتوو *ئیزابێل ئورای* لەدایكبووی ساڵی (١٨٤٥) لەدایكبونەوە گوێچكەی نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ئافرەتە توانایەكی مەزنی هەبووە لە بیستندا كە لەرێگەی كردنەوەی دەمیەوە قسەكانی دەبیست.

خاتوو *ئیزابێل ئورا* لەئاكامدا لەگەڵ پیاوێكدا زەواجی كرد بەناوی *ئورا*، واتە گوێچكە.

٨٩

# ساڵ دوای دەستگیرانەكەی

*مانیلدا* *جونی* ئینگلتەرایی ساڵی ١٧٩٥ كۆچی دوای كرد، دەستگیرانەكەش دوای ٨٩ ساڵ بەدڵ شكاوی كۆچی دوایی كرد.

# نوسینی چوار وشە پێكەوە

خاتوو *ڤیالیا* كە ژنێكی خەڵكی بەرلینە بەهرەیەكی زۆر سەیری تیا دروست بووە؛ *ڤیالیا* دەتوانێت لەیەككاتدا چوار وشە بنوسێت.

# تۆپێك لەسەریدا

سەرەڕای خواردنی ئەو هەموو ئیسپرینە كچێكی ئیتالیی تەمەن حەڤدە ساڵ هێشتا ئەو هیچی لەو سەر ئێشە قورسە كەم نەكردوە كە ماوەیەك بوو پێوەی دەناڵاند، تا ئەو كاتەی سەردانی پزیشكی كردو دوای دوای چەندین پشكنینی جۆراوجۆر دەركەوت تۆپێكی بچوك لەناو سەریدایە.

## ٦٥٢ گەنج و ٥٠ پیاو

ئادریان جیومی بەلجیکی لەتەمەنیدا شووی بە(٥٠) پیاو کردووەو خۆی لە(٦٥٢) کوڕی گەنجیش هارە بڕیوە.

## لەحەوت ساڵدا ١٤ کوڕی دەبێت

خاتوو جوزیفین کە خەڵکی ویلایەتی شیکاغۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە تەنیا لەماوەی حەوت ساڵدا چواردە کوڕی بووە.

## ژنێکی ریشدار

*ئادریان* کە ژنێکی خەڵکی پاریس بوو ریشی هەبوو هەروەکو ریشی پیاو.

## منداڵ بوونێکی سەیر

خانمێکی عێراقی تەمەن (٢٠) ساڵ کە خەڵکی شاری نەجەفی پیرۆزە ساڵی ١٩٦٥ منداڵێکی چوار قاچی بوو، منداڵەکە سەری لەسەری ئەسپ دەچوو، کێشی تەنیا (٥٠٠) گرام بوو.

## هەمو شتێك بەقاچ

*جلیان توماسی* بەریتانی تەمەن (١٨) ساڵ توانی بەلێهاتوویییەکی بێئەندازەوە بەقاچەکانی ئۆتۆمبیل لێبخورێت، پۆلیسی هاتوچۆش هیچیان پێنەکرا جگە لەوەی مۆڵەتی شۆفێری بدەنێ.

## حەوت رۆژ سەماکردن

ژنێك لەهیندییە سورەکانی ئەمەریکا ساڵی (١٩٢٥) بۆ ماوەی (١٧٢) کاتژمێر بێوەستان سەمای کرد. ماوەی سەماکردنی ئەو ئافرەتەی سەر بەرەگەزی هندییە سورەکانی ئەمەریکا یەکسانە بەحەوت رۆژو شانزە کاتژمێرو شەش دەقیقە.

## بەردێکی (٩) کیلۆگرامی

لەهەندێك لەبیابانەکانی ئەفەریقای گەورەدا دانیشتوانەکەی لەو بڕوادان: ئەو ژنانەی منداڵیان نابێت ئەگەر بەردێکی نۆ کیلۆ گەرامی هەڵبگرن دەستبەجێ منداڵیان دەبێت.

## بکوژی حەوت پیاو

پولێکی پۆستە لەپرتوگال وێنەی ژنێکی پێوەیە، گوایە ئەو ژنە لەکۆتایی تەمەنیدا بەهۆی مەقاشی فرنی ماڵەکەیانەوە حەوت پیاوی لەئیسپانییەکانی دوژمنی پورتوگال کوشتوە.

## درێژترین ماوەی سکپڕیی

❗.. زانراوە کە ماوەی ئاسایی‌و تەواوی سکپڕی لە ئافرەتاندا (٢٧٣) رۆژە، بەلاّم ژنێکی بەریتانی تەمەن (٢٥) ساڵ ئەم سنورەی بەزاندو منداڵەکەی بۆ ماوەی (٣٨٩) رۆژ لەسکیدا مایەوە، واتە یەك ساڵ‌و بیست‌و چوار رۆژ.. ئەم ژنە لەرۆژی (٣ کانونی یەکەمی ١٩٥٤) منداڵێکی بەکێشی (٢,٦٠٠) کیلۆ گرامی بەمردویی بوو.

❗.. بەلاّم درێژترین ماوەی سکپڕی کە منداڵەکە بەزیندویی مایەوە خاتوو *کریستین هۆجتۆنی* بەریتانی تەمەن (٢٨) ساڵ بوو کە ماوەی (٣٨١)رۆژ منداڵەکە لەسکیدا مایەوە، واتە ساڵێك‌و هەڤدە رۆژ. جێی ئاماژەیە منداڵەکەی *هۆجتۆنی* کێشی (٣,٤٠٠) کیلۆ گرام بوو.

## بچوکترین دایك

منداڵبون لەدوای تەمەنی دوانزە ساڵییەوە شتێکی ئاساییە، بەلاّم خاتوو *لیزا مولنیا* کە خەڵکی پیرۆیە، لەتەمەنی سێ ساڵ‌و نیویدا کەوتە سوڕی خوێنی مانگانەوەو لەتەمەنی پێنج ساڵ‌و هەشت مانگیدا لەباوکێکی نەناسراو لە( ١٤ ی حوزەیرانی ١٩٣٩) منداڵێکی هێنایە دنیاوە، دوای ئەوەی لەرێگەی نەشتەرگەرییەوە لەسکییان دەرهێنا.

## درێژترین بێداری

*بیرتفان درێر مارفی* تەمەن پەنجاو دوو ساڵ لەئەفریقای باشور توانی لەهەوڵێکی ناوازەدا درێژترین ماوەی بێداریی (بەخەبەربوون) بۆ خۆی تۆماربکات.. مارفی ماوەی (٢٨٣) کاتژمێرو (٥٥) دەقیقە نەخەوت، واتە یانزە رۆژو نۆزدە کاتژمێر.

## کچێکی دووسەر

کچێکی دووسەر پێش ئەوەی ساڵی (١٧٣٣) لەتەمەنی دوانزە ساڵیدا بمرێت زانایانی ئەکادیمیای زانستی لەپاریس بەتەواوی سەرسام کردبوو.

زانایانی ئەکادیمیای ناوبراو ئەوەیان بۆ ئاشکرا بوو ئەو کچە دوو سەرەو، سەرە زیادەکەی هەست دەگوێزێتەوە بۆ سەرە راستەقینەکەی.. ئەمەش ئەو کاتانە ئاشکرابوو کە یەکێك لەزانایانی ئەکادیمیاکە زللەیەکی لەدەموچاوە زیادەکەی کچەکە دا، دەستبەجێ دەموچاوە راستەقینەکەی دەستی بەفرمێسك رشتن کرد.

## دوو چاوی رەنگاو رەنگ

ئافرەتێکی بەرەگەز لوبنانی لەشاری مشگانی ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا منداڵێکی کچی بوو، کچەکە دوو چاوی هەبوو یەکێکیان رەش و ئەوی تریان هەنگوینی.

## درێژترین نامە

درێژترین نامە لەجیهاندا خاتوو *تیری فینش*ی ئیسپانی نووسی، نامەکەی خاتوو *فینش* لە(١١ ی حوزەیرانی ١٩٦٩) لەسەر تۆمارێکی کاغەز بەدرێژی یانزە مەترو بیست سەنتیمەتر نوسراوەو نامەکەشی ئاراستەی دەسگیرانەکەی کردوە.

## باج خستنەسەر جوانی

لەرۆما یەکێك لەئەندامانی پارلەمانی وڵاتەکە پێشنیاریکرد باج بخرێتە سەر ئەو ئافرەتە جوانانەی کە لەرێگەی ئەو جوانییە سروشتیەی هەیانە دەتوانن سەرمایەیەکی زۆر کۆبکەنەوە.

## کێشی ١٦٠ کیلۆ گرامە

منداڵێکی خەڵکی ڤێننا ساڵی (١٨٩٤) کە هێشتا تەمەنی پێنج ساڵو شەش مانگ بوو کێشی گەیشتە ١٦٠ کیلۆ گرامو بەو هۆیەوە نەیتوانی چیتر رێی بکات.

## هەڵکەندنی لوت

ژن و پیاوێکی هیندی لەسەر نیو روپیە لێیان بووە شەڕو، پیاوەکە لەکاتی شەڕدا لوتی ژنەکەی هەڵکەند، بۆیە لەکاتی دادگایکردندا ژنەکە داوایکرد لەبەرامبەر تاوانەکەیدا لوتی مێردەکەی هەڵکەنرێت.

## زيندو دەبێتەوە

*ئان مارى* ئەو منداڵە بو کە لەگەرماى دە پلەى ژێر سفردا بۆ ماوەى ٢٠ کاتژمێر خرایە ناو سندوقێکەوە، بەلام خۆشبەختانە پەرستارێکى نەخۆشخانەکە گوێى لەدەنگى گریانبوو لەناو سندوقەکەوەو دەستبەجێ مەسەلەکەى بەپزیشکانى نەخۆشخانەکە راگەیاند، ئەوانیش سندوقەکەیان کردەوەو گواستیانەوە بۆ بەشى بوژانەوە، بەوەش لەمردن رزگاریبوو.

## منداڵى کلکدار

*مارگریت* کە ژنێکى تەمەن (٤٥) ساڵى خەلکى رۆمایە منداڵێکى کلکدارى هێنایە دنیاوەو، لەگەڵ ئەوەشدا منداڵەکە هیچ نیشانەیەکى نەخۆشى پێوە دیار نەبوو، ئەمەش بەدیاردەیەکى نامۆى جیهان دەژمێردرێت.

## لەشى کارەبایە

لەمارسى (١٩٨٩)دا لەئەمەریکا ژنێکى تەمەن مام ناوەندى کە ژیانێکى سادەى لەگەڵ هاوسەرو منداڵەکانیدا بەسەردەبرد، لاشەى ئەم ژنە زۆر سەر سورهێنەر بووە ئەویش بەوەى لەشى دەبووە کارەبا بەتواناى (٢٠٠٠) فۆڵت، کە لەمانگێکدا چەند جارێك گیانى دەبووە کارەبا، پێش ئەوەى حاڵەتەکە لێى روبدا توشى لەرزێکى توند دەبوو، لەو کاتەشدا دەستى بەهەر شتێکى

جیهان

کارەباییـــەوە بدایـــە تێکـــوپێکی دەدا، لەماڵیانـــدا زیـــاتر لەبیـــست ئـــامێری تەلەفزیۆن‌و سەلاجە بەهۆی ئـەو کارەبـاوە سـوتا بـوون.. ئـەم ژنـە ناوبـانگی دەرکردو هەرچی گۆڤاری زانستی هەبوو لەسەری نوسی.

ئەم خانمەوە سـەردانی کۆمپانیایـەکی ژاپـۆنی کـرد لەسـەر داوای خـاوەنی کۆمپانیاکە بەمەبەستی بەئاگابون لەهێزە بێئەندازەکەی‌و لەتاقیکردنـەوەدا بەدەسـت لێـدان لـە(٩٠٪) ئـەو ئـامێرە کارەباییانـەی تێکشکاند کـە لەلاشـەی بەسترابون.

ئەو خانمە ئەمریکیە دەڵێت:

نهێنی ئەو هێزە کارەباییە نازانم کە لەناو لەشمدایە، کـە پـێش دەرچـونی بەلەرزێکی بەهێز لەلەشمدا دەستپێدەکات.. من هاوسەرو منداڵـەکانم خـۆش دەوێـت‌و ئـەوانیش منیـان خـۆش دەوێـت، هـەر کاتێـك لـەو حاڵەتـە نزیـك ببمەوە پێیان دەڵێم لەماڵ بچنە دەرەوە نەوەك زیانێکیان پێ بگات.

# جوانترین ژن

شابانو ***تەفرتیتی*** تاکو ئێستاش بـەجوانترین ئـافرەتی جیهان دادەنرێـت، *تـەفرتیتی* دوای ئـەوە بـووە شـابانوی میـسر ناوبـانگی بەهـەموو جیهانـدا بڵاوبـووە.. جوانییـە ئەفـسوناویەکەی دوای (٣٣٠٠) لـەمردنی تائێـستاش لـە پەیکـەرە نیوەییەکەیـدا کـە لەمۆزەخانـەی میـسر دانـراوە بەئاشـکرایی دەدرەوشێتەوە.

*تفریتیت* لە (١٣٥٧ تا ١٣٧٣) پێش زایین ژنی شا *ئەختاتونی* پادشای میسر بووەو، ماوەیەکی کورت دوای مردنی هاوسەرکەی ئەمیش کۆچی دوایی کرد.

## کورتترین ژن

شازادە *سۆزانا* بەکوتترین ژن دادەنرێت لەجیهاندا، لەبەرئەوەی درێژییەکەی تەنیا (٧٥) سەنتیمەترە.

## کورتترین کچ

.. خاتو *بۆلای* یۆنانی بەکورتترین کچی جیهان دادەنرێت، خاتوو *بۆلا* کاتێك گەیشتە تەمەنی (٩) ساڵی درێژییەکەی تەنیا (٤٩,٢) سەنتیمەترو، کێشەکەی (١٠,٢٥٠) کیلۆ گەرام بووە.

.. شازادە (بولین) بە کورتترین کچی جیهان دادەنرێت، کاتێك گەیشتە تەمەنی ١٩ ساڵی درێژییەکەی تەنیا ٥٨ سم بوو کێشیشی ٢٠ کیلۆو ٥٠٠گرام بوو.

## گەورەترین ژن

خاتوو *برس بێرل* بەقورسترین و قەبەترین ژنی جیهان دادەنرێت بەوەی لەتەمەنی بیست و یەك ساڵیدا کێشی گەیشتە (٢٥٦) کیلۆ گرام، خاتوو *برس بێرل* سەرەڕای خوێن گەرمی و قسەخۆشی و حەزکردنی لەگاڵتەو

گەپ، هێشتا هاوسەری نەگرتووەو، بەڕای خۆی هێشتا پیاوێکی گونجاوی دەست نەکەوتووە تا شووی پێ بکات.

## ژنێکی شیردەر

ساڵی (١٩٢٥) ژنێکی خەڵکی ویلایەتی لوس ئەنجلوسی ئەمەریکا لەشیرداندا ریکۆردی جیهانی شکاندو تەنیا لەماوەی یانزە مانگدا بڕی (١٣٨٢) لیتر شیری خۆی بەرامبەر بە(٦,٩) جونەیهی ئیستەرلینی فرۆشت.

## ژنی بە پیاو بوو

دابونەریتی خێزانە ئەلبانیە شاخ نشینەکان وایە ئەگەر پیاوێکیان لەخێزانێکی تر کوشت، ئەوە گەورەترین کچیان شووکردن لەخۆی حەرام دەکات و جلوبەرگی پیاوانە لەبەرو هەڵسوکەوتی پیاوانە دەکات.. ئەم کچە دەبێتە سەرۆکی خێزانەکەی بێجگە لەتۆڵەکردنەوە هیچ ئەرکێکی تری لەئەستۆدا نابێت.

## گەورەترین ئاژەڵ

!.. گەورەترین و قورسترین ئاژەڵ نەهەنگی شینە کە ساڵی (١٩٢٠) مێینەیەکی لەمجۆرەیان لەجۆرجیای باشور دیتەوە درێژییەکەی (٣٣,٦٠) مەتر بوو.

!.. هەروەها ساڵی (١٩٣١) مێینەیەکی تریان لەوڵاتی ئەرجەنتین دۆزییەوە درێژییەکەی (٢٩,٢٦) مەتر بوو، ئەمە لەکاتێکدایە قورسی مێینەکی نەهەنگی شینی ئاوس دەگاتە (٢٠٠) تەن، واتە بەقورسی (٣٥) فیلی ئەفریقی.

## درێژترین ئاژەڵ

ساڵی (١٨٦٤) درێژترین ئاژەڵ کرمی قەیتانی دەریا کە لەگۆماوە کەنارییەکان دۆزرایەوەو درێژییەکەی (٥٤,٨٦٤) مەتر بووە.

## گرانترین ئاژەڵ

گرانترین ئاژەڵ ئەسپی رەسەنە لەتشرینی دووەمی (١٩٧٨٩) ئەسپی ئەفیرمید بە(١٤,٤) ملیۆن دۆلار فرۆشرا، دواتریش ئەلباند لە باخچەی ئاژەڵانی ساندیانم بە (٢٥٠,٠٠٠) دۆلار کڕیەوە بۆ باخچەکە.

## بەتەمەنترین ئاژەڵ

*کیسەڵ* بەتەمەنترین گیانلەبەر دادەنرێت، کە تەمەنی ئاسایی هەریەکەیان دەگاتە (١٥٢) ساڵ .

## بچوکترین هێلکە

هێلکەی *نەهەنگی شین*ە کە بەچاو نابینرێتو کێشی (٠,٠٠١٤١)ە لەگرامێکدا، هێلکەی ئەمجۆرە لەنەهەنگ بەخێرایی گەشە دەکات تا لە(٢٢) مانگدا کێشەکەی دەگاتە بیستو نۆ تەن، ئەویش یەکەم مانگی تەمەنیەتی.

## هێواشترین گەشەی ئاژەڵ

*بەتلینوس* ئەو ماسیە لەپکەدارەیە کە لەزەریای ئەتڵەسی باکوردا دەژیو لانیکەم ماوەی (١٠٠) ساڵی دەوێت تا هەشت سەنتیمەتر درێژ ببێت.

## درێژترین هێلکە

هێلکەی نەهەنگی قرشە کە لەکەنداوی مەکسیك دۆزرایەوە درێژییەکەی سیو هەشت سەنتیمەتر بوو.

# گەورەترین ئاژەڵی شیردەر

!.. گەورەترین ئاژەڵ لەناو ئاژەڵە شیردەرەکاندا *فیلی ئەفریقی*یە کە لەدارستانەکاندا دەژیو درێژییەکەی (٢,٢٠) سەنتیمەترەو کێشەکەی (٥٨٩٨) کیلۆگرامە.

!.. گەورەترین نێرە فیل ئەو فیلە بوو کە لە دووری ٤,٢٢٥ کیلۆمەترەوە تەقەیان لێکرد لە موکوسوی ئەنقولای باشور.

# گەورەترین مەمکدار

گەورەترین‌و قورسترین ئاژەڵی مەمکدار ئەو *نەهەنگە شینە* بوو کە ساڵی (١٩٤٧) لەگەشتی نەهەنگی روسی سلاڤادا لەئاوەکانی دەریای جەمسەری باشوردا راوکرا، درێژییەکەی ئەم نەهەنگە گەیشتە (٢٧,٦٦)و تەنیا دڵەکەی (٦٩٨) کیلۆ گرام بووە.

# بچوکترین مەمکدار

!.. بچوکترین ئاژەڵی مەمکدار ئەو دۆلفینانە بوون کە لەزەریای ئەتڵەسی باشوردا دەژین‌و درێژییان (١٢٢) سەنتیمەترەو (٤٠,١٨٢) کیلۆگرام کێشەکەیەتی.

جیهان

!.. دوای ئـەویش *ڕێـوی ئـاوە* کـە کێـشەکەی لـەنێوان (٢٤ تـا ٢٧) کیلـۆ گرامدایە.

## خێراترین گیاندار

*شێری ڕاوکەر* کە لەئەفـەریقاو ئێـران و ئەفغانـستاندا هەیە بـەخێراترین ناژەڵ دادەنرێت لەجیهاندا، خێرایی *شێری ڕاوکەر* لە زەوی هاماریـدا دەگاتـە (١٠٠) کیلۆمەتر لەیەك کاتژمێردا.

## گەورەترین و بەهێزترین ئەسپ

بەهێزترین و گەورەترین ئەسپی جیهان لەبـەلجیکا دایـەو نـاوی *بـروکلین سۆبرتیمە* هـەڵگری ناسـنامەی بەلجیکیـەو بـەپێوە بوەسـتێت بەرزییەکـەی ٢,١٣م و کێشیشی ٨٢٠کیلۆ گرام .

## بچوکترین ئەسپ

بـچوکترین ئەسـپ لەجیهانـدا لـە ئەرجـەنتین دایـەو، بەکورتـەبالاً تـرین ئەسپی جیهـان دادەنرێـت، ئـەم ئەسـپە لەیـەکێك لەکێڵگـەکانی قـاوەدا لـەلای جوتیارێکی پیری زۆر دەوڵەمەندە دەژی، ئەسپە کورتەبالاًکە کە خاوەنەکـەی بـە*ـبێللا* بـانگی دەکـات کێـشەکەی تـەنیا (١٠٢,٥) کیلـۆ گـرام و قەبارەکـەش هێندەی لەشی کەڵەشێرێکی کێڵگەیە.

## درێژترین ماوەی سکپڕی

لەلای ئاژەڵە مەمکدارەکان فیل بەچکەکەی (٦٠٩) رۆژ واتە بست مانگ و هەندێکجار ئەم ماوەیە درێژدەبێتەوەو دەگاتە (٧٦٠) رۆژ.

## کەمترین ماوەی سکپڕیی

*جەرابی* بەفەرەنسی یان ئەمریکی ناوی ئاژەڵێکە ماوەی سکپڕیی لەنێوان دوانزە بۆ سیانزە رۆژدایەو هەندێکجارماوەکە کورتتریش دەبێتەوە بۆ هەشت رۆژ. بەمەش *جەرابی* کەمترین ماوە بەچکەکەی لەسکی خۆیدا دەهێڵێتەوە.

## گەورەترین سەگ

لە ئەڵمانیای خۆرئاوا جۆرێك سەگ هەیە بەرزییەکەی مەترو نیوێکەو کێشەکەی دەگاتە (٢٨٢) کیلۆ گرامە، ئەم سەگە زەبەلاحە ناوی *بندیکتین*ە.

## گەورەترین غۆرێلا

غۆرێلای *زاك* تائێستا بەگەورەترین جۆری غۆرێلا دادەنرێت لەجیهاندا ئەم جۆرە غۆرێلایە کە ناوی *کوب نوجی*یە لەباخچەی ئاژەڵانی ژاپۆندا هەیە، بەرزییەکەی دوومەترو نیوە، کێشی (١٦١٠) کیلۆ گرامە.

*کوب نوجی* زۆر بەهێزەو دەنگێکی زۆر بەرزی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەکەمی دەبۆڵێنێت، ئەمەش لەبەرئەوەی *نوجی* مێینەیەو مێینەش

زۆر نەرمونیانە، هەر بۆیە پاسەوانەکەی خۆشی دەوێتو زۆر بەنەرمونیانی ڕەفتاری لەگەڵ دەکاتو هەمیشە خۆی بۆ ئەوە داناوە کە داواکارییەکانی جێبەجێبکات.

## بچوکترین گیانداری شیردەر

بچوکترین گیانداری شیردەر ئەو شەمشەمە کوێرەیە کە پێی دەوترێت *شەمشەمە کوێرەی کیسی لوتی بەراز* یان *شەمشەمە کوێرەی وێژەی هەنگ*، کێشی ئەم شەمشەمە کوێرانە (١,٧٥٧) گرامە.

## مەیمونێکی کورتە باڵا

بەبەراورد لەگەڵ غورێلای *زاك*ی زەبەلاحدا کە لەباخچەیەکی ژاپۆندا ژیان دەگوزەرێنێ، لەئەمەریکای باشور جۆرێك لەمەیمونی زۆر بچوك هەیە کە ئەگەر بەپەنجەکانت بیگریت هەڵدەزنێتە پەنجەکانتدا، وەك چۆن مەیمونێکی گەورە خۆی بەدارێکدا هەڵدەواسێت، ئەو مەیمونە ناوی *ئەلبێجی مارموسشی* لێنراوە، واتە مەیمونی کورتە باڵا.

## گەورەترین تیمساح

راوچـیانی ئوسـترالیا تیمـساحێکی گـەورەیان راوکـرد درێژییەکـەی (٦,٢٨)مـەتر بـوو، راوچـیەکان لەبـەر بـەهێزیو ترسـناکی نـەیانتوانی بـوو تیمساحەکە بگرن بۆیە ناچار بوون بیکوژن، دوای کوشـتن پێستەکەیان وەك یادگارێك بەسەر خۆیاندا دابەش کرد.

## ئاژەڵان و نوستنی زستانەیان

لەسەرەتای وەرزی زستاندا، لەسەرانسەی جیهانـدا ملیۆنـەها ئـاژەڵ توشی جۆرێکی تایبەت لەخەوتن دەبن پێی دەوترێت نوستنی زستانە.

نوسـتنی زسـتانە: جۆرێکـە لـە هۆیـەکانی ژیـان، کـە سروشـت بـەئاژەڵانی دەبەخشێت چونکە ناتوانن لەزستاندا خـۆراکی خۆیـان دابینبکـەن، هەنـدێك لە ئاژەڵە مەمکدارەکان، کە ئاژەڵی زستانە نوستون، گۆرانکاری زۆر گەورەیان بەسەردا دێت.. نوستنی زسـتانە جیاوازییـەکی زۆری هەیـە لەگـەڵ خـەوتنی ئاسایدا، بەوەی کە تیایدا پلەی گەرمای لەشی ئاژەڵەکە هێندە دادەبـەزێت تـا دەگاتە پلەی گەرمای کەشوهەوای دەوروبەر، وەك چۆن هەمانشت لەزسـتاندا لەخـشۆکەکاندا روودەداتو، لەهـەر دوو خولەکـدا یـەکجار دڵیـان لێـدەدات، بەگران هەناسە دەداتو بەهیچ جۆرێك پێویستی بە خواردن نییە.

لەهەریـەك لەماسـیو خـشۆکەکانو ئەوانـەی لەوشـکانیو ئـاودا هەرچـی فەرمانە سروشتییەکانیانە بۆ نزمترین پلە دادەبەزێت، ئەمەش بۆ پاراستنی گیانیانـە لـەکاتی نوسـتنی زسـتانەدا، لـەم حاڵەتـەدا بـەو ئاژەڵانـە دەوترێـت (دۆخی ژیانی هەڵواسراو).

# نوستنی زستانەی ژیژك

بـــەهاتنی وەرزی زســـتان ژیـــژك خـــۆی لەچەرمەســـەریەکی زۆردا دەبینێتەوەو، ئـەو روپۆشـە دڕکاوییـەی کـە لەقـەپو چڕنوکی دوژمنـەکانی دەیپارێزێت بەرامبەر بەسەرمای توندی زستان شتێکی ئـەوتۆی پێناکرێت.. ژیـژك لەســەرمادا پلـەی گـەرمای لەشــی بەخێراییــەکی زۆر دادەبــەزێتو پێویـستە ئـەو وزە لەدەستـچوەی بـەخواردنی زۆر قـەرەبوو بکاتـەوە، بـەڵام لەبەرئەوەی ئاژەڵێکی مێروو خۆرەو زۆر بەدەگمەن لەزستانـدا ئەو خۆراکەی دەسـتدەکەوێت بۆیـە کاتێـك بـەفر زەوی دادەپۆشـێت ئەگـەری مانـەوەی لـە ژیانــدا نامێنێـتو، بـۆ ئـەوەی ژیـژك بەســەر ئـەو کێـشەدا زاڵبێـت خـۆی دەشارێتەوەو تۆپەڵە دەکات ئەمجا نوستنێکی زستانەی لێدەکات کاتێك پلەی گەرما زیاتر لە(٥٠) پلـەی فـەهرنهایت دادەبـەزێت، بـەمجۆرە دەمێنێتـەوە تـا کاتێـك دونیـا گـەرم دەبێـتو خـواردنی جارێکیتر دەسـتدەکەوێتەوە لـەکات نوسـتندا ژیـژك پلـەی گـەرمای لەشـی خـۆی لەگـەڵ دەوروبـەری خۆیـدا رێکدەخات بەدوو پلە بەرزتر. ئەگەر پلەی گەرمای دەرەوە لە(٤٠) پلە زیـاتر دابەزی ئەوا ناتوانێت ئەو دوو پلە گەرمایە بـەرزە رابگرێت ئەگـەر ئـەوەش روبدات، مەترسی ئەوەی لێدەکرێت بیبەستێت.

کاتێــك ئــەوەش روبــدات ئــەوا ئەندامــەکانی نــاوەوەی لەشــی ژیــژك لەخۆیانــەوە دەســتبکەن بــەخواردنی بەشــێك لەپلــەی گــەرمای لەشــیان،

بەجۆرێك كە بەس بێت بۆمانەوەی لەژیاندا، هەموو ئەمانە لەکاتێکدا رودەدات کە ئەو ئاژەڵە نوستوە ئاگای لە هیچ شتێك نییە.

## نوستنی زستانەی مشکی کێوی

دەوترێت *مشکی کێوی* لەشیردەرە مەمکدارە بەریتانیانیەکانەو، لەناوچە شاخاوییەکانی ئەوروپادا دەژی، ئەم جۆرەی مشك دابونەریتی خۆی هەیە لەنوستنی زستانەیدا لەجیاتی ئەوەی بگەڕێت بەشوێن کونێك یان گۆشەیەکی گونجاودا بەقوڵی (٦ بۆ ١٠) مەترو پانی (٢٠) مەتر لەژێر زەویدا دروست دەکات کە لەهەریەکەیاندا زیاتر (١٥) *مشکی کێوی* نوستنی زستانە دەکەن.

لەهاویندا بەددانەکانی گژوگیا دەکرۆژنو لەبەرخۆر هەڵیدەخەن تا وشکدەبێتەوە، ئینجا دەیبەنە کونەیانەوەو رایدەخەنو زستان لەسەری دەخەون، بەجۆرێك سەریان دەخەنە نێوان هەردوو قاچی دواوەیان. *مشکی کێوی* چالاکییەکانی لەم وەرزەدا بەتەواوی کەمدەکات: هەناسەدان بەبەراورد لەگەڵ ئەندازەی هاویندا یەك بۆ پانزە کەمدەکات، هەروەها پلەی گەرمای لەشی لە (٩٧) پلەوە دادەبەزێت بۆ (٥٠) پلەو هەندێکجار بۆ (٤٠) پلە.

لەنوستنی زستانەدا *مشکی کێوی* لەیەککاتەدا هەرچی رۆنی لەشی هەیە هەموو بەکار دەبات، بۆیە کاتێك لەبەهاردا جارێکیتر دەژێتەوە دەبینی کێشی کەمی کردوە.

## خەوتنی زستانە مشکی خەواڵو

*مشکی خەواڵو* بەناوبانگترین گیاندارە کە لەزستاندا قوڵترین خەو دەکات، تەنانەت خەوەکەی بەنمونە دەهێنرێتەوە، کاتێك *مشکی خەواڵو* لەدۆخی نوستنی زستانەدایە بەشێوەیەك وەك تۆپ خڕدەکاتەوە، بەجۆرێك دەتوانرێت بەدەست بیگریت و بەسەر زەویدا تلاوتلی پێ بکرێت بێ ئەوەی خەبەری بێتەوە.

ئەم جۆرە لەمشك لەبەریتانیا هەیەو رەنگەکەی قاوەیی بەرەو سورەو جۆرێکی ئەوروپی هەیە کە دەخورێت، لەسەردەمی رۆمانیەکاندا خواردنێکی بەتاموچێژ بووە. لەپایزدا خۆراك بۆ خۆی هەڵدەگرێت تا لەبەهاردا کاتێك لە خەو رابێت بیخوات.

## نوستنی زستانە شەمشەمە کوێرە

*شەمشەمە کوێرە* گیانەوەرێکی گورج وگۆڵەو بەشەو خۆراك پەیدادەکات و بەرۆژ لەئەشکەوت و سەرداره کلۆرەکاندا پشوو دەدات، لەرۆژی خەوتندا خوێنی سارد دەبێتەوە رێژەی هەناسەدان و لێدانی دڵی دادەبەزێت. هەرچی زستانە کاتێك پلەی گەرما بۆ خوار (٥٠) پلە ئەوا شەمشەمە کوێرە بۆ ماوەیەکی زۆر دەخەوێت.

هاوکات چالاکییەکانی کەمدەبنەوەو ئەگەر خوێنی لە بەفر ساردتر بوو *شەمشەمە کوێرە* بەخەوی خۆی درێژە دەدات. *شەمشەمە کوێرە* تەنیا

گیاندارێکی مەمکدارە کە ئەگەر پلەی گەرمای لەشیشی بگاتە ژێر سفریش هیچ زیانێکی پێ ناگات، سەرەڕای ئەمەش بەئاسانی لەخەو رادێتو بەپێچەوانەی گیاندارانی ترەوە لەگەڵ هەستی کرد بەگەرمی یان تیشك یان دەنگەدەنگ یان دەستلێدان یەکسەر خەبەری دەبێتەوە.

*شەمشەمە کوێرە* خەوێکی سەیر دەکات بەوەی لەکاتی نوستندا سەری بۆ خوارەوەیەو دەتوانێت بەردەوامی بەو دۆخە بدات بەبێ ئەوەی ماندوی بکات بێت، هۆکاری ئەمەش خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە قورسایی لەشی وادەکات ژێی ماسولکەی پەنجەی پێکانی لەخۆوە گرژبێت لەسەر ئەو شتەی خۆی پێوە هەڵواسیوە.

## نوستنی زستانەی سمۆرە

*سمۆرە* لانەی خۆی بەسەر تەڵی دارانەوە دروست دەکاتو لەزستاندا بۆ ماوەیەکی زۆر دەنوون، لەگەڵ ئەوەشدا *سمۆرە* نوستنی زستانە ناکاتو، هەر کاتێك تۆزێك کەشوهەوا کەمێك خۆشبێت بۆی دەردەچێتو ڕاوی خۆی دەکات.

سمۆرە لەسەر دارو درەختەکان هەندێکیان هەندەکەی تریان راودەنێن، لەپایزدا لەناو دارە کلۆرەکاندا گەنجینەی بچوك بچوك دروستدەکەن بۆ ئەوەی خۆراکەکانیانی تیادا بشارنەوەو لەزستاندا دێنەوە سەری‌و دەیخۆن. بەلام زۆربەی جار رێگە هەڵدەکەن‌و نایدۆزنەوە.

## نوستنی زستانەی مار

لەگەڵ هاتنی وەرزی زستاندا مار دەستدەکات بەگەڕان بەشوێن جێگەیەکدا تا نوستنی زستانەی تێدا بکات، زۆرتر لەنێوان ریشەی دارو درەختو بنەبەردا نوستنی زستانە دەکات، ئەوەی جێگەی سەرنجە بیست بۆ سی مار بەسەریەکەوە لەشوێنێکدا دەخەون.

## نوستنی زستانەی بزن مژەك

*بزن مژەك* لەکونی زەویدا دەخەوێت، لەبەریتانیا *بزن مژەك* چاڵێکی قوڵ هەڵدەکەنێت، تا وەرزی زستان تیایدا بنوێت، کەچی *بۆق* خۆی لەقوڕو لیتەی کەناری گۆماوەکاندا دەشارێتەوەو بەدرێژایی زستانو تا سەرەتای بەهار دەرناچێت، جێی باسە ڤیراندنەکەی زمانی گفتوگۆو داوای هاوسەرێتیکردنە.

## خەوتنی زستانەی گوێچکە ماسی

رەنگە هەندێك کەس پرسیار لەچۆنیەتی خەوتنی زستانەی *گوێچکە ماسی* بکەن کە ئایا بەراستی دەخەوێت؟

لەراستیدا بەلێکۆڵینەوە لەسەر ژیانی ***گوێچکە ماسی*** لەلایەن زانایانی ئاژەڵناسی پسپۆڕەوە، دەرکەوتووە کە ***گوێچکە ماسی***یەکان وەك گیاندارانی تر نوستنی زستانەیان هەیەو، ئەوەش بەخۆشاردنەوە لەنێوان رەگوریشەی گژوگیادا دەست پێدەکەن، ئینجا بەداخستنی دەمی لەپکە (صدف)کە یان بە پەردەیەك لەماددەیەکی لینج بۆ ئەوەی لەوشکبونەوە بیپارێزێت.

# هەزار پێی گەورە

گیاندارێکی ئاوی زۆر گەورەیە هەندێك لەدەریاوانەکان لەگەشتەکانیاندا بینیویانەو، لێکۆڵینەوەیان دەربارە کردوە بەم جۆرە له***هەزار پێ***یە دەوترێت (ام الحبر).

# دەربارەی پشیلە

... ***پشیلە*** گیاندارێکی گۆشتخۆرەو لەریزی ئاژەڵە دڕندەکاندایە، خۆشترین گۆشت لەلای ***پشیلە*** گۆشتی ***ماسی***یە، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە بۆ یەکەمجار ***پشیلە*** لەکەنارەکانی دەریای سپی ناوەراستدا ژیاوەو، لەسەردەمی میسرییە کۆنەکانەوە خەریکی راوکردنی ماسی بووە، میسریەکان ***پشیلە***یان پەرستوە، بۆیە کاتێك ***قەمبیری*** پادشای فارسەکان پەلاماری میسر داوە لەپێشەوەی سوپاکەیەوە لەشکرێکی پشیلەی خستوەتە پێشەوە، میسرییەکان کاتێك ئەوەیان بینیوە ئەژنۆیان شکاوەو نەیانتوانوە بەرەنگاری هێزەکانی دوژمن ببنەوە.

## جیهان

!.. *پشیله* له ساڵێکدا دوجار دەزێت جارێك لەوەرزی بەهارداو جارێکیتر لەوەرزی پایزدا، ماوەی سکپڕیشی لەنێوان (٥٦ تا ٦٠) رۆژە.

!.. بەچکەی *پشیله* نۆ تا دە رۆژ چاو ناتروکێنێت، دوای ئەو ماوە چاویان دەکەنەوە دەستدەکەن بەرێکردن‌و پاش شەش هەفتە لەتوانایاندا دەبێت خواردن بخۆن، دوای ئەوەی تا شەش هەفتە تەنیا شیری دایکییان دەخۆن.

!.. *پشیله* هەمیشە حەزی بەلانە کۆنەکەیەتی‌و حەز ناکات بەجێی بهێڵێ‌و ئەگەر جێشی هێشت دڵی لایەتی‌و ئەگەر پاش چەند ساڵێکیش بێت دەگەرێتەوە بۆی.

!.. *پشیله* زۆر هەستی ناسکە بەکەمترین دەنگ تێکدەچێت‌و بەرنامەی سینەماو تەلەفزیۆن کاری لێدەکات.

!.. یاسای ئینگلتەرە سزای ئەو خاوەن پشیلانە دەدات کە پشیلەکانیان دەچنە ماڵە دراوسێ بۆ مریشك‌و کۆترخواردن.

!.. *پشیله* توشی کۆمەڵێك نەخۆشی دەبێت، لەوانە: هەرسنەکردن‌و رشانەوەو سکچوون.. هەروەها لەرزوتاو سیل‌و نەخۆشی بۆ منداڵان دەگوێزێتەوە.

!.. زۆرێك لەخەڵکی خۆرئاوا بڕوایان وایە پشیلەی رەش شومەو، بەهەمانشێوە راوچیانی دەریا بەبینینی پشیلەی رە.. رەشبینی دایان

دەگریێت و، تەنانەت هەندێکیان ئەگەر پشیلەی رەشیان بینی دانابەزنە دەریاو بەبێ راوکردن دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ.

## دادگایکردنی ئاژەڵان

!.. ساڵی (١٥٨٥) لەڤالانسی هەرێمی درۆمی فەرەنسا دادگا دانیشتنێکی تایبەتی سازکرد بەمەبەستی دادگایکردنی کرمێك کە نەخۆشی خستبووە ناو کێڵگەی جوتیارێکەوە، سەرۆکی دادگا پارێزەرێکی راسپارد بۆ بەرگریکردن لەکرمە تۆمەتبارەکە، دادوەر بڕیاریدا کە ئەگەر سزای کوشتنی بەسەردا نەسەپێنرا، ئەوا پێویستە لەو هەرێمە درو بخرێتەوە.

!.. ساڵی (١٢٦٦) *بەرازێك* بەتۆمەتی کوشتنی منداڵێك رەوانەی دادگای هەرێمی فونتنی فەرەنسا کرا، دوای دادگایکردن دادوەر سزای لەسێدارەدانی بەسوتاندن سەپاند بەسەر بەرازەکەدا.

ئەوەبو لەناوەراستی شاردا ئاگرێکی گەورە کرایەوە بەئاشکراو بەبەرچاوی هەموو خەڵکەوە بەرازەکەیان سوتاند.

!.. هەروەها ساڵی (١٣٨٦) دادگای لافالیزی فەرەنسا حوکمی ملپەڕاندنی بەسەر بەرازێکدا سەپاند بەرامبەر تاوانەکەیدا کە بریتی بووە لەبڕینی سەرو قاچی منداڵێکدا، لەگۆڕەپانی شاردا ئەو سزایە بەسەر ئەو بەرازەدا جێبەجێکرا.

## سەمەرەکانی ئاژەڵان

جیهان ........................................................................

/.. *بابەهان* لەتوانایدایە دەنوکەکانی بۆ سەرەوەو خوارەوە بجولێنێت، لەکاتێکدا هیچ باڵندەیەکی تر ناتوانێت ئەوە بکات.

/.. *سەقاکوژ* حەزی بەگۆشتی بەچکە پشیلەیەو بەتاموچێژە دەیخوات.

/.. لەبەرامبەردا *پشیلە*ش بەهەمانشێوە حەزی لەگۆشتی بەچکەی سەقاکوژەو تاموچێژ لەگۆشتەکەی وەردەگرێت.

/.. *بۆق* کاتێك دەمی کراوە بێت ناتوانێ بەباشی هەناسە بدات، بۆیە ئەگەر بەهێز دەمی بکەیتەوە هەناسەی دەبڕێت دەمرێت.

/.. *بەراز* هەرگیز توانای مەلەکردنی نییە، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە *بەراز* هەردوو دەستی دەکەوێتە نزیك ژێر سکییەوە ئەگەر کەوتە ناو ئاویشەوە ئەوا بەبڕینی (زور) خۆی دەکوژێت.

/.. *کەروێشك* هەرگیز چاوی نانوقێنێت، چونکە پێڵوی چاوی نییە، لەجیاتی ئەوە پەردەیەکی گۆشتی تەنك هەیە کە لەکاتی خەوتندا دەکشێتە سەرچاوی.

/.. لە لەشی *ئاسك*دا بێجگە لەهەردوو کونە لوت جێگەی تریش هەیە بۆ هەناسەدان.. سروشت ئەمەی پێبەخشیوە تا لەکاتی راونانیدا تەنگە نەفەس نەبێتو پەکی نەکەوێت.

!.. *ماسی* بەبێ جوین خواردنەکەی دەخوات لەبەر ئەوە بەبەردەوامی دەمی دەکاتەوەو دایدەخات ئەگەر ئەو خواردنەی دەیخوات لەدەمیدا بهێڵێتەوە ئەوا دەخنکێت.

!.. چاوی *باز* هەرگیز ناجوڵێتەوە بەماسولکەیەکی بەهێز لە کاسەی خۆیدا جێگیر، بەڵام ئەو ناتەواوییەی بەسەر بادان قەرەبوو دەکاتەوە کە دەتوانێت بۆ جوڵاندنی لەشی، بەسەری بازنەیەکی (٣٦٠) پلەیی دروست بکات.

# خێراترین باڵندە

خێراترین باڵندەی جیهان باڵنـدەی *ئەلسامەی*ـە کە لەتوانایدایـە لەیـەك کاتژمێردا لانیکەم نزیکەی (١٨٠) کیلۆمەتر دەبڕێت.

# باڵندەی زۆر بێژ

ئـەو بابەهانـە ئەفەریقاییـە خۆڵەمێـشی ڕەنگەیـە کـە بـەناوی *برۆدێـل*ـەوە خاوەنەکەی کابرایەکی خەڵکی لەندەنە بەناوی *لین لوک*، ئەم بابەهانـە تـاکو ئێستا دوانزەجار لەسەریەك خەڵاتی باشترین باڵندەی قسەکەری وەرگرتووە.

# گەورەترین باڵندە

لــەنێوانی (٨٦٥٠) جــۆر باڵنــدەدا *وشــتر مــورغی* بــاکوری ئەفــەریقا بەگــەورەترین باڵنــدەی جیهــان دادەنرێــت.. *وشـتر مـورغ* کـە لەچـیاکانی ئەتلەسـی لەسـەنگالو سـودانو حەبەشـە دەژیـن، کێـشی نێرەکـەی دەگاتـە (١٥٦,٤) کیلۆ گرام.

# قورسترین باڵندەی فڕیو

باڵنــدەی *کـوڕی* بەقورســترین باڵنـدەی فڕیـو دادەنرێـت لەجیهانـدا، ئـەم باڵندەیـە لەئەفـەریقای خۆرهـەڵاتو باشـور هەیـە، درێـژەی باڵـەکانی (٢,٥٤) مەترو کێشی هەریەکەیان (١٨,١٤) کیلۆ گرامە.

# خێراترین باڵندەی فڕیو

خێراتـرین باڵـندەی فڕیـوی جیهـان جـۆرێکی باڵندەیـە (*بلقـشە*) کـە بەمراوییـە مەلەوانەکـە ناسـراوەو، ڕەنگـی سـنگی ئـەم باڵندەیـە سـورە.. خێراییەکی سەیری هەیە لەیـەك کاتـژمێردا لەتوانایدایـە (١٢٨,٧) کیلۆمـەتر ببڕێت.

# گەورەترین هێلکەی پەلەوەر

گەورەترین هێلکەی پەلەوەران هێلکەی *وشترمورغە* کە کێشی هەریەکەیان لەنێوان (٦٣٤ بۆ ١,٧٥٩) کیلۆ گرام دایە، تیرەی هێلکەکەش لـەنێوان (١٠,١٦ بـۆ ١٥,٢٤) سەنتیمەتردایە.

هێلکـەی *وشـترمورغ* تـوێکڵێکی ئەسـتوری هەیـە کـە دەگاتـە (٠,٢٤٣) سـەنتیمەتر، ئـەم توێکڵە لوتوانایدایـە پیاوێـك بەکێـشی (١٣٦,٩٨) کیلـۆ گـرام هەڵگرێت بەبێ ئەوەی کاریگەری لەسەری هەبێت .

# زۆرترین زەردێنەی هێلکە

لە تەممووزی ساڵی ١٩٧١ لەشاری نیویـۆرك و لەیـەکێك لەکێڵگەکانی خـاتوو *دیانا پتسورت* لەناو هێلکەیەکدا نۆ زەردێنەی هەبوو.

## هەنگی ویزە ویزکەر

لەدورگەی هیندی خۆرئاوا بچوکترین باڵندەی دەنگخۆش هەیە بەناوی *هەنگی ویزەویزکەر* دەناسرێتەوە، لەشی ئەم باڵندەیە بەئەندازەی مێش هەنگێکەو، لەویش بچوکتر هەیەو ئەمەیان لەکوبا دەژی کە بەبچوکترین باڵندە دادەنرێت لەجیهاندا، ئەم باڵندە بێوێنەیە لەکاتژمێرێکدا (٤٨)کیلۆمەتر دەبڕێت.. کێشی هەنگی *ویزەویزکەر* لەدوو گرام کەمترەو لەچرکەیەکدا دوو سەدجار باڵەکانی لێك دەدات، هەروەها دەتوانێت وەك فرۆکەی ئەلیکۆپتەر بەئاسمانەوە بوەستێت.

## مل یاقوتی ویزە ویزکەر

ئایا هیچت دەربارەی باڵندەیەکی هیچ بیستووە کە لەتوانایدا بێت (٨٠٠) کیلۆمەتر بەبێ وەستان ببڕێت؟..

لەویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا جۆرێك باڵندەی دەنگخۆش هەیە کە قەبارەی لەشی پێنجیەکی قەبارەی لەشی چۆلەکەیەکی ئاساییە.. رەنگی ملی ئەم باڵندەیە یاقوتییەکەی قەشەنگەو، رەنگی باڵەکانی رەنگێکی بەرەو سورەو، رەنگی سنگی رەنگێکی یاقوتییەکی کراویە.

باڵندەی *مل یاقوتی* لەسەر شیلەی گوڵو مێرووە بچوکەکان دەژیو ئەم مەلە دەنگخۆشە لەئەمەریکادا دەژیو تاکو ئێستا هیچ فرۆکەیەك نییە بەخێرای ئەم بڕوات.

ئەم باڵندەیە لەوەرزی زستاندا کۆچ بۆ باشوری کەنەدا دەکاتو زستانان لەناوچەی نیستیوانیەکان لەفلۆریداو ناوچەکانی بەرەو باشور بەسەر دەبەن.

## باڵندەی دڕندە

لەدورگەکانی ئۆقیانوسی ئارامدا جۆرێك بابەهان هەیە پێی دەوترێت *کیا* کە لەهەموو بابەهانەکانی تر گەورەترە، بەجۆرێك درێژییەکەی دەگاتە (٥٠) سەنتیمەتر، رەنگیشی ئاڵتونییەکی زەردەو شوێنی لەدایکبوونی نیوزلەندەیە، *کیا* خۆی لەسەر خواردنی گۆشتو پاشماوەی پیسیو گۆشتی مرداربووە راهێناوە، ئەگەر خواردنی دەستنەکەوێت ئەوا بۆ پەیداکردنی ژەمە خواردنێك پەلاماری گیاندارانی تر دەدات.

## باڵندەیەکی چوار قاچ

گەنجێکی لوبنانی *بازێکی* زۆر سەیری راوکرد، بازەکە کە چوار قاچی هەبوو لەکاتی راوکردنیدا چەندینجار ئەو گەنجە لوبنانییەی روبەڕوی مەترسی مەرگ کردبووە تا لەناکامدا ناچاریکرد بەتفەنگەکەی تەقەی لێبکاتو بیکوژێت.

هەرچەندە پارەیەکی باشیان دایە ئەو گەنجە تا ئەو نێچیرەی بفرۆشێت بەڵام قبوڵی نەکردو بریاریدا لەگەڵ گیانلەبەرە وشك کراوەکانی تردا لە مۆزەخانە تایبەتیەکەیدا دایبنێت.

## درێژترین جاڵجاڵۆکە

ئەو جاڵجاڵۆکەیەی کە بەبێوەژنی رەش ناسراوە، لەهەردوو ئەمەریکادا دەژیو درێـژی مێینەکـەی (٦,٢٥) سـەنتیمەترە، پێـوەدانی هێنـدە بـەهێزە لەماوەیەکی کورتدا دەتوانێـت مرۆڤ بکوژێت.

## گەورەترین جاڵجاڵۆکە

لەئەمـەریکای باشـوردا جۆرێـك لەجاڵجاڵۆکـە دەژی کـە بەچـۆلەکە خـۆر ناسـراوەو لەنیـسانی سـاڵی (١٩٢٥) یـەکێك لـەمجۆرە گیانـدارە دۆزرایـەوە کـە درێژییەکەی (٨,٨) مەتر بوو درێژی قاچێکی (٢٥,٤) سەنتیمەتر بوو.

## قورسترین جاڵجاڵۆکە

قورسـترین جاڵجاڵۆکـە لەجیهانـدا جاڵجاڵۆکـەی تـارا نتۆلایـە کـە لەسـاڵی (١٩٤٥) لەبەرازیل بینراوەو کێشەکەی (١,٣٦) کیلۆگرام بووە.

## گەورەترین جاڵجاڵۆکە

جـۆرێکی زۆر گـەورەی جاڵجاڵۆکەیــە لەبــەرازیل دەژیو بــەهێزترینو گـەورەترین جـۆری جاڵجاڵۆکەیـە لەجیهانـدا، قەبارەکـەی کاتێـك بوەسـتێت چـارەکە مـەترێك دوو ددانـی دەرپــەڕیوی گـەورەی پێوەیـە سـەرەو خـوار وەستاندویەتی چاوەڕێی نێچیر دەکات.

## شەمشەمە کوێرەی دارکونکەر

هەنـدێکجار زانایـان پێـی دەڵـێن شەمـشەمە کـوێرەی مـەرگ Watch Beetles Death بەوەی کە داری مـاڵان کونـدەکات لـەم پـەڕ بـۆ ئـەو پەڕ دەیـشکێنێتە سـەر خاوەنەکەیـدا بـێ ئـەوەی هـیچ گوناهێکیـان بێـت تـەنیا ئەوەندە نـەبێت ئـەو جانـەوەرە گوشـندەیە میوانیانـە، جـۆرێکی تـریش لـەو شەمشەمە کوێرە هەیە ئەمانەیان زیان بەدارستان دەگەیـەنن بـەکلۆرکردنی دارو درەختەکانی.

## مێروی روناکی بەخش!!

لەدارستانەکانی ئەمـەریکای باشـورو دورگـەکانی هینـدی رۆژئـاوا جۆرێـك مێـرو دەژیـن ئەگـەر کارەبـاش بـڕا یـان لـەتاریکی شـەودا دەیـان خەنـە نـاو شوشـەیەکەوە تیـشکێکی سـەوز دەبەخـشن بـەجۆرێك دەتوانرێـت کتێـب لەبەردەمیدا بخوێندرێتەوە.

## سەمەرەکانی مێرولە

مێرولە نیشکەرەکان لەرۆیشتنیاندا بـۆ جێگەیـەك بۆنێـك دەرژێننـە سـەر رێگەکە تاخۆیانو مێروەکانی تریش وەکو رێنمایکەر سودی لێوەربگرن، ئـەو هۆرمۆناتـە سـودی ئاگادارکردنـەوەی هەیـە بـۆ پاراسـتن لەهـەر مەترسـیەکی هاوشێوەی لافاوو ئاگرکەوتنەوە.. هێمایەکیشە بۆبانگکردنی شارە مێرولەکە

**سەیرو سەمەرەکانی...........................................**

بۆ کۆبونەوەو رزگاربوونیان لەو مەترسییو سودی هەیە لەکرداری ڕێکخستنەوەی لەشدا بەو شتانەی پێوەنوساوە بەبەکارهێنانی دەم.

هەروەها بۆن گوزارشتە لەداواکردنی یارمەتی لەکاتی پێویستدا یان گواستنەوەی نێچیرێکی گەورە بۆ ناوی شارەکە، گرنگترین ئیشو فرمانی ئەو مادده کیمیاوییە ئاگادارکردنەوەی شارەکەیە بەبوونی مێرولە مردو لەناو شارۆکەدا بەمەبەستی رزگاربوون لەتەرمەکەی‌و، ئەم دیاردە بەنمونەیەکی باش دادەنرێت لەتوانای ئەو هۆرمۆناتە بۆ کۆنترۆڵکردنی رەوشتی مێرولە کاتێك مێرولەیەك دەمری‌و دەرزێت ئەو بۆنە تایبەتەی لێوەی دەردەچێت، مێروەکانی تر دەیگوێزنەوە دەرەوە لەدەرەوەش دەینێژن.. زانایان تاقیکردنەوەکەیان لەسەر ئەم مادەیە کرد بەرژاندنی بەسەر مێرولەیەکی زیندودا ئەنجامەکەی ئەوە بوو مێرولەکانی تر بەزەبری هێز ئەو مێروەیان کردە دەرەوە سەرەرای بەرەنگاری‌و خۆراگرتنی مێرولە زیندوەکە، ئەنجام فرێیاندایەی شوێنێکی دور هەرچەندە مێرولەکە هەوڵیدەدا بگەرێتەوە بۆ شارەکەی جارێکی تر سەر لەنوێ فرێیاندایە دەرەوەو ئەمەش درێژەی کێشا تا بۆنەکە لەسەر لاشەی مێرولەکە رەویەوە ئینجا توانی بگەرێتەوە بۆ ناو شارەکەی.

# چی دەربارەی دوپشك دەزانیت؟

دوپـــشك مـــرۆڤ ناگـــەزێت بـــەڵكو پێـــوەی دەدات، هـــەروەها بـــەمێروە جاڵجاڵۆکەکانیـــشەوە دەدات بـــۆ ئـــەوەی پێـــشی خـــواردنی لـــەپێیان بخـــات.. دوپشك و جاڵجاڵۆکە لەگروپی مێروەکان نین، لەبەر ئەوەی مێروەکـان شـەش پێیان هەیە بەڵام جاڵجاڵۆکەو دوپشك خـاوەنی هەشـت پـێن، کاتێـك دوپـشك تورە دەبێت هەرچی بێتە رێگەی پێـوەی دەدات، ئـەویش بـە بەرزکـردنـەوەی کلکـی بـۆ سـەرەوە کـە چـزوەکەی وەك دەرزیـەك وایـەو کیـسەیەك ژەهـری تێدایـە، ژەهـری دوپـشك بەگـشتی مـرۆڤ و گیانلەبـەرە گـەورەکان ناکوژێـت، بەڵام ئازارێکی زۆریـان پێدەگەیـەنێت، ئەگـەر مـرۆڤ چـەند جارێـك دوپـشك پێوەی بدات، ئەوا هەستکردنی بەئازار کەمدەبێتەوە، دوپـشك وەك مێرولـەو مێـــشەنگ ژیـــانی کۆمەڵایـــەتی نازانێـــت، بـــەڵکو هەریەکـــەیان بەتـــەنیاو بەشـێوەیەکی سـەربەخۆ دەژیـن، بـەوەش زیـاتر رقیـان لەیـەکتر دەبێـتەوە ئەگـەر دوو دوپـشك توشـی یـەکتر بـبن بەجـەنگ دێـن تـا سـەرئەنجام بـە لەناوچـــونی یـــەکێکیان کۆتایـــدێت.. کـــرداری بەیەکگەیـــشتن لـــەنێوان دوپـشکەکاندا لـەماوەی چـوار مانگـدا دەبێـت لەسـەرەتای حوزەیرانـەوە کـە تیایدا نێرو مێینەکان لەشوێنی خۆیان دێنـە دەرەوە بەمەبەسـتی جوتبـوون دوپشکە مێینەکان هێلکەکانیان لەسەر پشتی خۆیان دادەنێن تـا دەتـروکێن و، دوپـشکە بـچکۆلەکانی لێدەردەچـێت تـاوەکو دوو هەفتـە لـەژێر سەرپـشتی دایکیانـدا دەمێننـەوەو ئینجا دایکیان لەناودەبەن.

## زۆرترین بەچکەی مار

جۆرێك ماری تایبەت هەیە پێی دەوترێت *ئادەر* چەند جۆرێکی هەیەو لە بەریتانیاو کیشوەری ئەوروپاو ناوچە شاخاوییەکانی (ئەلب)دا لە بەرزی (٢٣٣٠) مەترەوە.

هەرچەندە زۆربەی جۆرەکانی مار هێلکە دەکەن بەڵام ئەمجۆرە مارە بەجارێك هەفتا بەچکەی دەبێت سەرەرای ئەوەی جۆرە ئاساییەکەی (٦ تا ٢٠) بەچکەی دەبێتو ژیژك هێرش دەکاتە سەر ئەو بەچکانەو بەئاسانی دەیانخوات، مارە دایکانەکەش کە بۆ بەرگریکردن لەبێچووەکانی بەو ژیژەکەوە دەدات، بەڵام ناتوانێت پێستی ژیژکەکە ببرێت ئەگەریش پێوەی داو گەستی ئەوا ژیژك بەرگریەکی سروشتی هەیە لە دژی ژەهر.

## ژەهراویترین مار

!.. بەهێزترین ماری ژەهراویی ماری دەریایە ژەهرەکەی سەد بەرامبەر ژەهری ماری تیبانی ئوستورالیایە، ئەمجۆرە مارە زیاتر لەلێوارەکانی ئوستورالیای باکوری خۆرئاوا دەبینرێت.

!.. بەهێزترین ماری ژەهراویی سەر وشکانی ماری دڕندەیە کە لەباشوری رۆژئاوای تویزلاندو باکوری رۆژهەڵاتی ئوستورالیای باشور دەژی.

# درێژترین ددانی مار

درێژترین ددان، دانی مارێکە بەناوی *گابۆن* کە لەئەفریقای ئیستیوائیدا دەژێت، ماری گابۆن درێژییەکەی (١٨٢) سەنتیمەترەو درێژی هەر ددانێکی چوار سەنتیمەترە.

# گەورەی دارستان؟!!

بێگومان لە ناو گیاندارانـدا *شێر* پاشای دارستانە. لەخشۆکەکانیش پادشایەکی دارستان هەیە ناوە زانستیەکەشی (Lachesis Mutus) ئەمجۆرە مارە لەناوچە ئیستیوائیەکانی ئەمەریکادا دەژیو درێژییەکەی چوار مەترەو دەتوانێت بێچوە سەگێك قوت بداتو ماسولکەکانی زۆر بەهێزنو بەئاسانی نێچیرەکەی قۆتدەدات، پێچ بەدەوری نێچیرەکەیدا دەدات تاوەکو ئێسکەکانی ورد دەکاتو دەیکوژێت ئینجا بەئاسانی دەیخوات.

# گەورەترین مار

لەباخچەیەکی ئاژەڵان لەئەفریقادا مارێکی زۆر گەورە هەیە درێژیەکەی (٨,٢٥)مەتر دەبێت، خواردنی رۆژانەی ئەم مارە بەرخ یان بزنێکە کە زۆر بەئاسانی قوتی دەدات و دوای ئەوە دەچێتەماڵەکەی خۆیەوە تا بەشێنەیی هەرسی بکات.

# لە پاشماوەی سەردەمی خشۆکەکان

لەئۆقیانوسی *ئارام*دا کۆمەڵە دورگەیەك هەن پێیان دەوترێت دورگەکانی *جالا باجوس* کۆمەڵە دورگەیەکی روتن لەسەردەمی گڕکانە دێرینەکانەوە دروستبوونو مرۆڤی لێ ناژی، دەستەیەك لێکۆڵەری زانستی بۆ گەران چونە ئەو دورگانەو جۆرێك لەخشۆکیان دۆزییەوە لەچەشنی *برس* بەناوی *لێگوانە*، ئەمجۆرەی خشۆکە بێوێنە درێژییەکەی (١٣٥) سەنتیمەترو هاوشێوە خشۆکە لەناوچوەکانە کە درێژییەکەی (٢٦,٢٤)مەتر بووە.

## گەورەترین ماسی

گـەورەترین ماسـی ماسـی *قرشـی نەهـەنگ*ە کـە لـەدەریاکانی *کیـپ تـاون*دا دۆزراونەتەوە، درێـژی ئـەم ماسییە (١٨,٥١٦)مـەترو کێشەکەی (٤٠٨١,٥) کیلـۆ گرامە.

## بچوکترین ماسی دەریا

ماسـی *فـۆبـیـ*ـیـە کـە لەدورگـەکانی *مارشـال*دا دەژی، درێژییەکـەی لـەنێوان (١,٦٣ بۆ ١,٨٨) سەنتیمەتردایە، *فۆبی* رەنگێکی ناویی هەیـە، بـۆ یەکـەمینجار ساڵی (١٩٤٠) دۆزرایەوەو، کێشەکەشی دوو ملیم گرام بووە.

## ماسی بلگە Hatchet–Fish

لەقوڵای هەزار مەتری ناو دەریادا دەژی، ئـەم ماسییە دوچاوی هەیـە کـە لەشێوەی تۆپدایە بەسەر سەریەوە، لەشـی هێڵـی پـانی تێدایـە، درێژییەکـەی (٨) سەنتیمەترەو، تیشکێکی زیوی دەردەکات.

## ماسی ترسناك The Chimera - Fish

درێژی ئەم ماسییە ترسناکە یەك مەترەو جۆرێك تیشك دەردەكات لەشێوەی هەورە بروسكە، لەقوڵاییە زۆرەكاندا بەهێواشی دەڕوات، لەشێوەیدا وەك قرشی Shark وایە، لەشێكی كرکراگەیی هەیە نەك ئێسكی.

## ماسی سەوڵ لێدەر Oar- Fish

لاشەیەكی هەڵتۆقیوی پانی هەیە درێژییەكەی لەسەروی شەش مەترومیە، كێشەكەی نزیكەی (١٥٢٨) كیلۆ گرامەو، وەك *مار* مەلەوانی دەكات، بەدرێژی پشتی باڵێكی سوری درەوشاوەی پێوەیە، دوو پۆپینەی لەپێشە سەریەوە هەیە كە رەنگیان سوری درەوشاوەیە.

## ماسی لوس The Dragan - Fish

لەقوڵی زیاتر لە(٥٠٠) مەتردا دەژیو درێژییەكەی (١٥٠) سەنتیمەترە، لەهەردولای لەشیەوە ریزێك روناكی هەیە وەكو چرای هەڵكراو وایە ئەگەر جێگایەك زۆر تاریكیش بێت رۆشنی دەكاتەوە، دەمێكی گەورەی پێوەیە بەدوو ریز ددانی زۆر تیژ نەخشێنراوە.

## ماسی راوچی Angle - Fuish

ئەم جۆرەی ماسی رەنگێكی تاریكی هەیەو لەقوڵایی زیاتر لە(١٠٠٠) مەتردا دەژی، دەمێكی زۆر گەورەی پێوەیە كە دوو ریز ددانی زۆر تیژی كوشندەی تێدایە، گەدەیەكی زۆر گەورەی هەیە كە بەئەندازەی هەموو

سەیرو سەمەرەکانی....................................

لەشیەتی، لەپێشی سەریەوە زیادەیەك هەیە کە بۆ سەرەوە چووە، بۆ چێژکردنی ماسیەکانی تر بەکاری دەهێنێت بۆیە ناونراوە *ماسی راوچی*.

## Swalloeer - Fish ماسی گەیوو

لەماسی ئاوە زۆر قوڵەکانە، خاوەنی گەدەیەکی زۆر گەورەیە کە بەئاسانی دەکشێت، بۆیە لەتوانایدایە ماسی لەخۆی گەورەتریش بخوات، رەنگی قاوەییەکی تێرە ددانەکانی زۆر تیژە، دەمێکی گەورەو کلکێکی درێژی پێوەیە لەکلکی مار دەچێت ئەوەندە نەبێت کلکی ئەم دڕکاویە.

## Lantera –Fish ماسی چرا

درێژییەکەی نزیکەی هەشت سەنتیمەترەو درەوشاوەیە، زۆرجار دێتە سەر ئاو بەجۆرێك لەشەودا دەریاوانەکان روناکیەکەی دەبینن، بەشەو هێڵێکی روناکی دروست دەکات.

## Pelican –Fish ماسی سەقاکوژ

لە ئاوە زۆر قوڵەکاندا دەژی، دەمێکی پانی هەیەو رەنگەکەی سەوزێکی تێرە، *ماسی سەقاکوژ* بەشێوەی مار درێژەو سەرێکی گەورەی هەیە، کاتێك دەمی دەکاتەوە لەسەری خۆی گەورەترە.

## Lighting –Fish ماسی راوچی درەوشاوە

..................................................................... جیهان

شێوەی سندوقییەو دەمو سکێکی گەورەی پێوەیە کە لە لەشی گەورەترە، لەبەشی دواوەی لوتیدا زیادەیەك هەیە وەکو چرا روناکی دەبەخشێتو، ددانەکانی لەشێوەی خەنجەردایە لەلای چەناگەیدا لقێکی دەرچوی هەیە وەکو لقی دار وایە بۆ ماسی گرتن بەکاری دەهێننێت.

## ماسی ئەویسوبروکتس سولیاتس Oiois Thoproctn –Fish

ئەمنەیان لەجۆری بچوکەو سکێکی پانو هەلتۆقیوی هەیە شێوەی لەبەرازی زرێپۆش یان راوچیانی سەدەکانی ناوەراست دەچێت کە چۆن کلاویان دەکردە سەریان، لەقەبارەی بەرازێکدایە، رەنگێکی سوری تێرەو تیشکێکی سور دەر دەکات لەپێشەوەی سەریدایە رێگای پێ دەدۆزرێتەوە.

## شلەماری ئەڤۆست Avocet Eel –Fish

جوتێك شەویلگەی زۆر سەیری پێوەیە هاتۆتە دەرەوە بۆ هەردولای سەرەوەو خوارەوە چەماوەتەوە لەشێوەی بازنە یان مانگێکی بچوکدایە، زۆر باریكو درێژە، رەنگەکەشی ئالتونییەکی بریسکەدارە، بچوکەکانیان هێندە رونن ئێسکەکانیان دیارە.

## مارماسی دان شمشێری

لەماسی ئاوە قوڵەکانەو لەسەر ماسی تر دەژی کاکیللەیەکی گەورەی پێومیەو ددانەکانی هێندە تیژن دەڵێی شمشێرە، لاشە درێژەکەی وەکو مارێکی سەوزی تێر وایە.

## ماسی بێ ناو Unknoun –Fish

ئەو ماسییە هێشتا هیچ ناوێکی لێنەنراوەو زانایان گیریان خواردوە بەدەست ناوەکەیەوە.. لێکۆڵینەوە لەسەر سروشتو ژیانی، ئەوەندەی توانیویانە لەسەر ئەو ماسییە بزانن ئەوەیە کە رەنگەکەی وەنەوشەییەکی بەرەو رەشە دوو چاوی گەورەو دەمێکی زل پێومیە کە لەدەمی پیاوێکی بێ ددان دەچێت، شێوەی لەژێر ئاوی دەچێت بەسەرییەوە دوو درك هەیە وەك رووناکییەك بەکاری دێنێ.

## گەورەترین گیان لە بەری ئاوی

*نەهەنگی شین*ە کە درێژییەکەی دەگاتە (٣٣) مەترو کێشەکەشی دەگاتە (١٢٠) تەن پانی کلکی حەوت مەترە، درێژی باڵەکانی پێنج مەترەو قورسی ماسولکەکانی پەنجا تەنە، لانیکەم بیستو پێنج تەن رۆن لە لەشیدایە، جگەرکەشی (٥٠٠) کیلۆگرامەو تەنیا دڵی (٣٥٩,٤٤)

کیلۆ گرامه، دەمی زۆر گەورەیه، بەڵام گەدەی تەسکە، دەمی دانی تیدا نییه بەڵام دوولای پێوەیه لەهەرە دەچێت، لەسەرو وردە ماسی دەژێت سەرەڕای ئەوەی زۆر قەبەیە، بەڵام لەگەڵ ئاودا قوتی دەدات دوای بەزمان ئاوەکە فڕێ دەداتە دەرەوەو ئەو ددانە هەرەییانە ڕێگە لەهاتنە دەرەوەی ماسییەکان دەگرن، *نەهەنگی شین* هەر بیست خولەك جارێك دێتە سەر ئاو، پرۆسەی هەناسەدانیشی لەڕێگەی کونەکانی لوتیەوە دەبێت کە لەتەوقی سەریدایە.

# نەهەنگی خوێنرێژ

لەدونیادا جۆرێك نەهەنگ هەیە پێی دەوترێت *نەهەنگی خوێنرێژ* ناوەکەی بەلاتینی *ئورکنیس ئورکا* یە لەتایبەتمەندیەکانی ئەم نەهەنگە کوشندەیە، درێژی مێینەکەی بەئەندازەی نیوەی درێژی نێرەکەیەتی کە نزیکەی (١٠) مەترەو کێشی چەند تەنێك دەبێت، *نەهەنگی خوێنرێژ* بەدڕەندەترین و دوژمنترین گیانداری ئاویی دادەنرێت، دووران لەکاچێرەکانی زۆر ترسناکن و لەکاکیلە دەچێت و، هۆکاری ناولێنانەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زۆر جار کۆمەڵ دەبەستن و هێرش دەبەنە سەر کۆمەڵانێکی تر بەبێ هیچ هۆیەك و بەخراپترین شێوە لەناویان دەبەن بەبێ ئەوەی هیچ دوژمنایەتیەکیان لەگەڵیاندا هەبێت.

## نەهەنگی شاخدار

لەناوچەی بەستەڵەکی باکوردا جۆرێك نەهەنگ هەیە شاخیان هەیە، ناوی زانستی ئەم نەهەنگە (*مونـودون/ مونوسـیرس*)ەو دیمەنێکی سەیری هەیە، نێرەکانیان ددانەکانیان پێچاوپێچەو زۆر درێژو قورسە لەمادەی عتجیشە، درێژی هەر ددانێکی سێ مەترە، هەروەها شاخێکی بەهێزی هەیە کە سەهۆڵبەندانی دەریاکانی پێ دەشکێنێت تاوەکو ئاژەڵێکی مەمکدار هەوا هەڵمژێت، لەشاخیدا کونێکی تێدایە بۆ هەوا هەڵمژینە، خەڵکی ئەسکیمۆ بۆ گۆشتەکەیان راویان دەکەن‌و لەرۆنە زۆرەکەشی سود وەردەگرن، چونکە بەکاریدەهێنن بۆ خۆگەرمکردنەوەو ئاگرکردنەوە.

## ئایا گیاندارێك هەیە نەخەوێت؟

هەرچی بەچوار قاچ بڕوات دەبێت کاتێکی هەبێت تێدا پشوو بداتو ماندویەتی خۆی دەربکات بۆ ئەوەی هێزو تواناو چالاکیەکانی بۆ بگەرێتەوە، زۆربەی ماسییەکان دەنوون: هەیانە لەکاتی خەوتندا لەشوێنی خۆیدا مەلەدەکاتو بەبێ جوڵە لەشوێنی خۆی دەمێنێتەوە، هەندێکیان خەوتون لەشوێنی خۆیاندا وەك ماسی *ئەسپی دەریا* و، کەچی ماسی *قرش* لەو جۆرانەیە کە ناخەوێت، ئەمەش زانایانی

سەرسامکردوە، لەبەرئەوەی هەمیشەو بەبێ وەستان لەدۆخی مەلەکردندایە.

گورجوگۆڵی ماسی قرش نائاساییە لەبەرئەوەی ئەگەر بریندار بوو هەست بەئازار ناکات و لەشەڕو خواردنی خۆی ناکەوێت و هەرگیز کۆڵنادات.. ئەڵێن تەنانەت ئەگەر شتێکی تیژ سکی بدڕێت و ریخۆڵەکانی دەربێت، لەخواردنی خۆی ناکەوێت.

هەروەها جۆرێك لە قرشی شین هەیە دەتوانێت بەخێرایی ژێرئاویەکی خێرا بچێتە ژێر ئاوەوە، ماسی قرش بێجگە لەسەری بریتیە لەکۆمەڵێك ماسولکەی جوڵاو.

## ماسی پڵنگ

وەك چۆن لەدونیای ئاژەڵاندا پڵنگی دڕندەو کوشندەیە هەیە، بەهەمانشێوە لەدونیای دەریاشدا پڵنگی کوشندە هەیە، لەئاوە گەرمەکاندا جۆرێك ماسی قرش هەیە ناوی *قرشی پڵنگ* بۆیە ئەم ناوەیان لێناوە چونکە هێرش دەکاتە سەر هەموو شتێك مرۆڤ، گیانلەبەر، تەنانەت قرشەکانی تریش، هێندە گەورە دەبێت تا درێژییەکەی دەگاتە ٤,٥ – ٩ مەتر هەندێك جار دێتە بەندەرو رێگە ئاویەکانیشەوە هێرش دەکاتە سەر هەرچی یەك رێگەی لێبگرێت لە مرۆڤ، گیانلەبەران تەنانەت لە هاوشێوەکانی خۆی لەماسی و قرش.

## ماسی بەچێژەوە پیسی دەخوا

لــەجیهانی گیانلەبەرانــدا جۆررێــك بــەراز هەیــە لەســەر پیــسیو پاشماوەکـان دەژێـت هـەروەها لـە جیهـانی دەریاشـدا جۆرێـك لـە ماسـی قـرش شـین هەیـە کـە درێژیەکـەی لـەنێوان (٥–٧) مەتردایـە، زۆرتـرین گۆشتی مرۆڤ دەخوات و شوێنی کەشتیەکان دەکەوێت هەرچی پیس و پاشـەڕۆیەك فـڕی دەدرێتـە خـوارەوە دەیخـوات تەنانـەت ئەگـەر تەنەکەو شوشـەو قوتـوش بێـت.. هـیچ هـیچ سڵ ناکاتـەوە لەپـەلاماردانی مـرۆڤ و لـەناوبردنی، لەگـەدەی یـەکێك لـەو دڕنـدە ترسـێنەرەدا جوتێـك کەللـەی مـەڕو بەشـی دواوەی بـەرازێك و سـەگێك بەسـەرەوەو بەسـاغیو جوتێـك پێڵاوی کۆن (٢٠٠) تـەن گۆشـت کـە سەرچـاوەکەی نـەزانراوە دۆزرایـەوە لەگەڵ نیو دەستە شوشە کونیاکدا، ئەم قرشە شینە خوێنمژە دەتوانێت لە سەعاتێکدا (٤٨) کیلۆمەتر ببڕێت.

## ماسی جەنگاوەر

درێــژی ئــەو ماســیە جــەنگاوەرە نزیکــەی (١٨٠) ســەنتیمەترەو، ســەرەڕای دیمــەنی جـوانی رەنگـە ئـاڵو والاکـەی، کەچـی شـەڕانییەو لــەولاتی تایلەنــد دەژیو لەتەنیــشت کەڵەشــێری شەرشــانیدا لــەناو حەوزێکدا دادەنرێت بۆ فرۆشتن، ئەو ماسییە پێویستی بەئۆکسجینی تـواوە هەیـە کـە لەرێگـەی ئەنـدامانی سـەروی کونـە لوتیـەوە راسـتەوخۆ

وەریدەگریت، وەکو ماسی لاپرنتی لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێت لەناو بږیت بەڵام لەکاتی هەوا مژیندا کە بە دەمە گەورە کراوەکەی دەیمژێت بەرزدەبێتەوە لەکاتێك دوو نێرە بەیەکدەگەن دیمەنێکی زۆر جوانتر دروستدەکەن، لەجەنگێکی خوێناویدا زۆرجار یەکێکیان ئەوی تریان لەناودەبات.

## ئایا بیستووتانە ماسی سیی هەبێت؟

لەخۆرهەڵاتی ئەفەریقا بەتایبەتی لە گۆماوو زۆنگاوە وەستاوەکاندا جۆرێك لەماسی سەیر دەژی بەناوی *دیتۆی*.. سی هەیەو بەدەرکەوتنی زۆر کۆنەو دەتوانرێت بەپێشینەی هەموو گیاندارە زەمینییەکان دابنرێت، ماسی *دیتۆی* پێنج جۆری زیندوی هەیە درێژییەکەی (١٨٠) سەنتیمەتر یان تۆزێك زیاتر دەبێت.

بەرۆژ لەناو قوڕدا دەنوێت و لەکاتی خۆرئاوا بووندا دەچێتە ناو ئاو بەمەبەستی هەناسەدان، لەکاتی بێ بارانیشدا کاتێك زۆنگاوەکان وشکدەکەن لەناو قوڕدا خۆی دەنوشتێنێتەوە، کونی بچوك لەقوڕەکە دەکات بۆ چونە ژورەوەی هەوا، بەمجۆرە لەخەوێکی قوڵدا دەبێت و لەچەوری لەشی خۆی دەخوات، تا جارێکیتر باران دەبارێتەوە.

## ماسی جوڕیی سـی خالْ

جۆرێکی لەماسی سی دار، هۆکاری ناوناکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەندامێکی هەناسەدانی زۆر ئالۆز دروستکراوی هەیەو راستەوخۆ لەسەروی کونە لوتەکانیەوە هەناسە دەدات.

لەگروپی ماسی *سیامی* کوشندەیە ئەم دوو جۆرە هەردوکیان بۆ هەناسەدان دێنەسەر ئاو نێرەی ئەو هەردوو جۆرەشی هێلانەکەیان لەسەر ئاو دروستدەکەن لە تۆقڵەیەکی بنجاوی کە هێلکەکانی تیدەخەن دوای چاودێری دەکات تا دەترووکێت، نێرە کانیش خەریکی بێچوەکان دەبن ئەوەی سەیرە ئەم جۆرە ماسیە مێ کانیان بە هیچ جۆرێ گرنگی نادات بە بێچوەکانی.

## ماسی نیون

یەکێکە لە ماسی یە بچکۆلە هەرە زیرەکەکان، کە لە ئاوە سازگارەکانی ناوچەی ئیستیوائیدا دەژێت، کاتێك دەڕوات دو شریتی شینی رۆشنا دەبینرێت وەکو گلۆپی نیۆن، ئەوەی کە سەیرە لەم ماسیەدا کاتێك سەرما یان تورە دەبێت رەنگی رەش دادەگەڕێت.

جیهان

## ماسیش ئاگاداره بەسەر زەمین لەرزەدا

لەیابانـدا زانایـانی دەریـا بـۆ زانینـی کـاتی زەمـین لـەرزە پـشت بەجۆرێکی تایبەتی لە ماسی دەبەن، کە پێی دەوترێت ماسی (سەوڵ لێدەر) دەڵێت:

ماسی سەوڵ لێدەر کە لە قوڵایی ۲۰۰ مەتر ژێر ئاودا دەژی ئەگەر هاتە سەر ئاو ئەوە مانای وایە زەمین لەرزەیەکی زۆر گەورە خەریکە ڕوبدات، بەجۆرێك ئەو ماسیە لە قوڵاییەوە دێتە سەرەوە وەکو داوای ڕزگاربون بکات، توانرا بە هۆی هاتنە سەر ئاوە وەی دووماسی جۆری زەمین لەرزە زان پێش بینی زەمین لەرزە بکرێت، ئەم ماسیە ڕەنگەکەی زیویەو درێژیەکەشی هەندێکجار دەگاتە ٥ مەتر.

مۆزەخانەی دەریایی سەر بەزانکۆی تۆکای ژاپۆن دەڵێت: دوو ماسی ڕاوکراون لەنزیکی تۆکیۆ لەجۆری زەمین لەرزان پێش بومەلەرزەکەی دورگەی *ئینجیینا* لەساڵی ١٢٩٦٣دا.

ئەم دیاردەیە چەند ڕۆژێکی کەم پێش ڕودانی بومەلەرزەکەی ئەواجیمای ساڵی ١٩٦٨ دوبارە بووە، لەکۆنیشدا پێشینیان بەگیانداره ماڵیەکانی وەك سەگ و پشیلە ڕودانی زەمین لەرزەیان زانیووە، کاتێك بەبێ هیچ هۆیەك میاندویانەو وەڕیون، هەروەها باڵندە دەنگ خۆشەکان لەئاواز وتن، کەوتون زانایان لەژاپۆن پێیانوایە دیاردەی ماسی بومەلەرزەزانیان بەدیاردەیەکی ناسروشتییە، لەبەرئەوەی ئەو ماسییە

کاتێك دێتە سەر ئاو یان مردوە یان دەمرێت. هاتە سەر ئاوی وەك ئەوە وایە لەمردنەوە رابکات بەرەو مردن، مردنیشی هەواڵێ روداني زەمین لەرزەکەیە.

## ماسی تیر وەشێن

لەئاوە گەرمەکانی روبارەکانی خۆرهەلاتی دوردا دەژی، خاوەنی شێوازێکی زۆر سەیرو نامۆیە لەڕاوکردندا، دێتە سەر ئاو بۆ گەران بەشوێن خواردندا لەو مێروانەی بەسەر گەلای روەکەکانەوەن، کە مێرویەك دەبینێت چەند جارێك لەسەریەك لیکی بۆ فڕی دەدات، بەخێراییەکی زۆر تاوەك نیشانەکە دەپێکێت و مێروەکە لەشوێنەکەی خۆی دەکەوێتە خوارەوەو ئەویش زۆر بەئاسانی دەیکاتە، فراوێنی.

## ماسی پشیلەی دەریایی

جۆرێکی زۆر سەیرە لەماسی کە نێرەکانی بەئەرکی دایك هەڵدەسێت، دوای ئەوەی مێینە هێلکە دەکات نێرە دەیخاتە دەمیەوە، مانگێك زیاتر لەدەمیدا هەڵەیدەگرێت دوای ترەکین دوو هەفتە هەر لەدەمیدا دەیهێڵێتەوە، سەرەڕای بوونی (٥٠) هێلکە یان ماسی بچوك لەدەمیدا ناتوانێت هیچ خواردنێك بخوات، بۆیە ناچاردەبێت بەدرێژەی ئەو ماوەیە کە دەگاتە شەش هەفتە بەرۆژوو بێت.

## قورناویلکەی دێم ئاوژی ( سمندل البرمائی )

لە ئەمەریکادا قورناویلکەیەکی تازەیان دۆزییەوە لەماسی دەچێت، بەڵام دوو ئامێری هەوا هەڵمژینی پێوەیە ئەوانیش دوو لوتە کە لەژێر ئاوەوە هەوای پێ هەڵدەمژێت لەگەڵ سییەکدا کە لەدەرەوەی ئاو هەوای پێ هەڵدەمژێت، ئەویش لەبەر ئەوەی گیانداریکی وشکاوییە (برمائی) واتە لەوشکانو لەدەریادا دەژی.

# داری گەورە

!.. لەهەموو دروستکراوێکی خودا (شاز) هەیە، هەیە کورتە بالآیەو بان بەپێچەوانەوە زۆر گەورەیە، وەکو دەبینین لە رەگەزەکانی مرۆڤدا کورتە بالآ هەیە ئەوانەی کە لەبیرکراوەکانی ئەفریقیادا دەژێت و ژیانیان لەسەر میوەو روەك و هەنگوینە. هەروەها زەبەلاحیشیان تیاەبینین ئەوەندە گەورەیە-کاتێك کەسێکی ئاسایی لەگەڵیدا دەوەستێت هەست بە بچوکی دەکات لە رەگەزی داریش چەندین جۆری داری گەورەو بەناوبانگ هەیە، بۆ نمونە داری (*سیکوریا*) کێشەکەی نزیکەی ۲۰۰۰ تەنە و ۱۵۰ تەن گەلای پێوەیە و ۸۰۰ مەتری سێجا ریش داری لێدەردەهێنێت و لە دارستانەکانی ئەمەریکاو بەریتانیادا دەڕوێت.

!.. هەروەها دارێکی تری زۆر گەورەمان هەیە بەناوی (*سیکوباجا یجانتیا*)یە، بە گەورەترین دار بەڵکو بەگەورەترین گیانلەبەری زیندوو دادەنرێت لەسەر ووی زەویدا، گەورەترین نمونەی کە ئەمڕۆ هەیە داری *جنراڵ شیرمانزە*-کە لەباخچە ئەهلییەکانی سیکوبای کالیفۆرنیادا هەیە، چێوەی رەگەکەی نزیکەی ۳۱ مەترەو تیرەکەشی نزیکەی ۹,۵ مەترە، بەرزییەکەشی نزیکەی ۸۳ مەترە، تەمەنیشی بەگوێرەی ئەو ئەڵقانەی کە سالآنە لێی بڕاوەتەوە دەریدەخات لەسێ هەزار ساڵ زیاتر بێت، ناوەکەشی لەسیکوبای سەرۆك خێڵی (شیروکی) بەناوبانگی هیندیەوە وەرگیراوە.

## ئەو دارەی خەڵك دەخوات!!

دەستەیەکی نێراوی ئینگلیزی پێش بیست ساڵ چونەیە کێك لەدروگەکانی زەریای ئارام لە گەرانەوەیاندا بۆ بەریتانیا هەواڵی دارێکیان لەگەڵ خۆیاندا هێنایەوە کە مرۆڤ و ئاژەڵ دەخوات، ئەویش ؟؟؟ گەلا زۆرەکانی بەدەوری قوربانیەکەدا بەجۆرێك هەموو خوێنەکەی دەمژێت و کاتێك وازی لێ دەهێنێت تەنیا ئێسکە پەیکەرەکەی ماوە. ئەو دەستەیە دەڵێت ئەم دارە لە هەمان دورگەدا دەژی کە (سندی بادی دەریایی) تیایدا دابەزیوەو سەیرو سەمەرەکانی ئەوێی باسکردووە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بڕوایان وایە گیانی باپیرانیانو خواکەیان خۆی لەگەڵاکانی ئەو دارەدا پەناداوە، بۆیە دەیپەرستن و بەپیرۆزی دەزانن و قوربانی بۆدەکەن، بەڵام چۆن کەسێك دەتوانێت لەو دارە نزیك بێتەوە، دەبێت خەوببینێت کە لە ژێریدا وەستا وە یان تەنیا خەوی پێوە ببینێ. هەر زو رۆژی دوایی بێ درۆ لای کاهن دان بە هەموو شتێکدا دەنێت، گوایە ئەم هەڵبژێردراوە بۆیە بڕوایان وایە توشی نەفرەتی هەتا هەتایی دەبێت.

## گوڵی کوشندە!

لەجیهانی روەکدا جۆرێك گوڵ هەیە کە گوڵی جوان دەگرێت، بەڵام لە نێوان گەڵاکانی دا مەترسییەك خۆی حەشارداوە بێ ئەوەی پێی بزانێت بۆ نمونە:

## گوڵی شوکرانی کوشندە!

سەربە خێزانی گەزەرو Canat بەقدە نوسە Parsly لە شێوەی چەتردایەو گوڵێکی سپی دەگرێت قەدیش وردە خاڵی سوری لەسەر کاتێك دەهارێدرێت بۆنێکی ناخۆش دەدات لە بۆنی مشك دەچێت Mousy لە شوێنە شێدارەکاندا گەشەدەکات، کونێن (Conuue) ناوی ئەو ژەهرە یە کەلە رەگەکەیدا دەردەهێنرێت و دەبێتە هۆی شەلەل Parolyois لە بەشی خوارەوەی مرۆڤەوە دەستپێدەکات و کە گەیشتە کۆئەندامی هەناسەدان لەماوەی چەند چرکەیەکدا ئەو کەسە دەکوژێت.

## روەکی گوێزی ڕشێنەرەوە Nuxyomica

روەکێکە لە ئاسایی ئیستیوائیدا دەژێت، بەرەکەی بە ئەندازەی پرتەقاڵێکی بچوکە پێنج دانە تۆوی تیدایە، لە تۆوەکەی ژەهرێك وەردەهێنرێت پێی دەوترێت (سترکنین) (Chununestry) ژەرهاوی بون بەسترکنین توشی گرژ بونی زۆر دەکات کە مردنی لەگەڵدایە، لە ئەنجامی وەستانی هەناسەداندا، لە کاری پزیشکیدا وەکو ماددەیەکی پەرێزدەر (منبهـة) (Stimulant) بەکاریدەهێنن کاردەکاتە سەر کۆئەندامی چەقە دەماری لەش.

Cintrol Nervious System

## ڕووەکی زەعفەرانی مروج Neadowsofform

هەروەها پێی دەوترێت (لحلاح) ئەم ڕووەکە ڕەنگی گوڵەکانی وەنەوشەیی تێرەو کە لە زەعفەران دەچێت Croaes، دوای ئەوەی لەپایزدا گوڵەکانی دەمرێت ژەهرێکی لێدروست دەکرێت بەناوی (کشلیسین) (Calchicine) هەرچەند خێرا ئەو کەسە ناکوژێت بەڵام بێ ئەندازە مەترسیدارە، لە بواری پزیشکیدا بۆ چارەسەری نەخۆشی شەو کوێری (نقرس) (Out) بەکاردەهێنرێت.

## ڕووەکی گوڵی کریسماس Christmasrose

گەڵاکەی سەوزێکە دەماری سوری تیدایە، جۆرە ژەهرێکی تێدایە پێی دەڵێن هیل یبورین (Helleberien)

## ڕووەکی سێوی دڕکاوی Thornapple

ناوە بازاڕییەکەی (داتورا)یە یەکێکە لە تاکەکانی خێزانی باینجان، ناوکەکەشی لەشێوەی تۆوی دڕکاویەکەیەوە وەر گیراوە (Spiny) کە لەکمستنا (Chentnut) دەچێت تائەندازەیەك کاریگەریەکەی وەکو مادەییەکی ژەهراوی لەلادۆنای ژەرهاوی (Shade Deadly Vight) دەچێت ئەم دو ڕووەکەش هەردوکیان هەردوو مادەی ئەترۆپین (Atropine)و هیوسیامین (Hyoscyamin)یان تێدایە، کە کاردەکەنە

سەیرو سەمەرەکانی...............................

سەر یەکخستنی کۆئەندامی (عصبی) هەروەها لەبواری پزیشکیشدا بەکاردەهێنرێت بۆ چارەسەری نەخۆشی هەناو، رەبو.

## روەکی ئیڤی ژەهراوی Poisen Tvy

روەکێکی هەڵزناوە نەژادی راستەقینەی ئەمەریکای باکورەو بە بەڵادا دەنرێت و مەترسیەکەی زۆری هەیە لە هەر کوێدا بروێت (رانتج) ئەو ژەهریە کە گەڵاو گوڵ و تۆو قەدەکەی دروستیدەکەن. تەنیا بەدەست پێوەدانی ئاوسان لە پێشدا دروستدەکات. تەنانەت کە دەسوتێنرێت دوکەڵەکەش ژەهراویەو هەرکەسێ ئەو دوکەڵەی بەرکەوێت کار دەکاتە سەری ئەگەر دوای ساڵێك یان زیاتریش بێت.

## گەورەترین دارستان

دراستانی دارە سنەوبەرییەکانە لە باکوری روسیادا کە دەکەوێتە نێوان هێڵی ٥٥ و بەستەڵەکی باکورەوە بە گەورەترین روبەری سەوز دادەنرێت لە جیهاندا یەکسانە بە ٢٥٪ ی دارستانەکانی جیهان.

## کۆنترین دار لەجیهاندا

کۆنترین دار لە جیهاندا لە ئەمەریکای باکوردایە دارێکە لە خێزانی سنەوبەرییەکان بەگەورەترین داری سنەوبەری دادەنرێت لە جیهاندا، تەمەنی مەزەندە کراوە بە ٤٩٠٠ ساڵ.

## گەورەترین دار

ئەو دارە گەورەیە یە کە لە کالیفۆرنیا دایەو ناوی (جنرالْ شیرمان)ەو بەرزییەکـەی ٨٢,٩١٨ مـەترە لـە باخـچەی سـیکۆبای نیـشتمانیدایەو، چێوە راستەقینەکەی ٢٤,١١ مەترە.

## گەورترین قەدی دار

قەدی داری (سـانتا مـار دیـاك تـول)ە لـە مەکسیك لـە جۆری سـەروەو قەدی لە نێوان ٣٤,١٧٩ تا ٣٤,٤٤٢ مەتر دایە.

## گەورەترین گوڵ

گوڵی زەنبەقە لە باشوری رۆژهەڵاتی ئاسای رەنگەکەی پرتەقاڵییـەکی بـەرەو قاوەییـە چـێوەکەی ٩١سـم و ئەسـتوری ٢سـم و کێـشەکەشی ٧ کیلۆ گرامە.

## گەورەترین پەتاتەی شیرین

هی (جورج دین) بوو لە (جیبونتوت)ی کالیفۆرنیا لـە سـاڵی ١٩٧٧ دا کێشی گەیشتە ١٠,٢٠٢ کیلۆ گرام

## گەورە ترین کاڵەك

ئەو کاڵەکە بوو لە کێڵگەی غریس نیو جێرس لە ساڵی ١٩٧٥ دا، کێشەکەی ٨٩،٩٤کیلۆ گرام بوە (ئید وییکی) خەڵکی گارولینای باکور بەرهەمی هێنا.

## بچوکترین گوڵ

بچوکترین گوڵ لە جیهاندا گوڵێکە بەناوی (جالنوجا یارفیفلورا) (Galinsogprviflora) بەزۆری لە ئەمەریکادا دەڕوێت، گولەکانی ئەم گوڵە لەشێوەی سەرێکدا (Head) کۆدەبنەوە درێژییەکەشی نزیکەی ١ ملیمەترە.

## گەورەترین گوڵ

گەورەترین گوڵ تا ئێستا لە جیهاندا هەیە دوو گوڵە، لەدارستانەکانی سۆمەترەی ئەندەنوسیادا دەڕوێت یەکەمیان ناوی (رافیلیزیا) یەو درێژی تیرەکەی لەمەترێك زیاترەو بەرزەیەکەشی لەسەر رووی زەوییەوە سێ چارەکە مەتر دەبێت، گوڵێکی سوری تێرە بەرەنگی زەر نەخشێنراوە پێنج گەڵاو کاسەیەکی هەیە لە شێوەی تەشتێکی گەورەی سەرداپۆشراو، یان مەنجەڵێکی گەورەی سەردانە پۆشراو دایە جۆری دووەمیان گوڵێکە پێی دەوترێت (ئەمورفوفالیس)

بریتیە لە قەدێك کە چەندین گوڵی هەڵگرتووە، ئەم گوڵە سێ مەتر درێژ دەبێت، هەردوو گوڵەکەش بۆنێکی ناخۆشیان هەیە، کە مێروو و مێشولە رادە کێشێت.

## روەکی ئاژەڵ خۆرا

روەکێکی بچکۆلەیە تیرەکەی لە ٥ تا ٨ سم-ەو گەڵاکانی لەسەر یەك ریز بووە لە شیوەی گوڵ هەر گەڵایەکیش ملێکی باریك و فودراوی هەیە لەسەر ئەو پانتاییە دەزولەیەکی درێژی هەیە، ئەو هەموو دەزولانە لە لایەکەوە لینجاوی لەسەرن لەراستیدا هەر گەلایەك لەو گەڵا یانە برتیە لە داوێك بۆ مێشوولە بچووکەکان. هەرچی مێرو یەکیش لەسەر ئەو دەزولانە بنیشێتەوە پێوەی دەنوسێت هەوڵدانی ئەو مێرووە بۆ رزگار بوون ئاگاداری ئەو دەزولەیە دەکاتەوە تا زیاتر خۆی پێچ بدات و زیاتر خۆی لەسەری دابخات، تاوەك مشتێکی داخراوی لێدێت. ئەولینجاوە سەسەرای ئەوەی تەڵەیەکە، لەهەمان کاتدا ماددەیەکی هەرسکەرە Digestive Fernnent لەشی مێروەکە دەتوێنێتەوە.

## گەورەترین کولەکە

کێشی ٢٣٢,٦٤٦ کیلۆ گرامەو (هارولد فۆلپ) چاندبووی لە (نینوای ئەندیانا) لە ساڵی ١٩٧٧ دا.

## گەورەترین پرتەقاڵ

شین وشون کالندین چاندی لە توکسونی ئاریزو نا لە ساڵی ١٩٧٧، قورسی ١,٦٧١کیلۆ گرام بوو.

## گەورەترین تۆو

تۆوی گوێزی هیندی جوتەیەکە کێشی تۆوەکەی ٢٣کیلۆ گرام، لە دورگەی (شیل)ی زەریای ئارامدا نەبێت لە هیچ شوێنێکی تری دو یادا ناڕوێت.

## بچوکترین تۆو

تۆوی درەختی (سەحلەبی هەڵزنیوە) ئەگەر سێ‌وپێنج ملیۆن تۆوی کۆبکەینەوە تا دەگاتە ٢٨,٤٥٣گرام.

## گەورەترین تۆوی ئەناناس

لە کانونی یەکەمی ١٩٧٧دا (ریتیف) لە مالیزیای کینیادا کردیەوە قورسییەکەی ٨کیلۆ گرام بوو.

## گەورەترین کلافە

لە جۆری سورە، کێشی ٥٥,٧٨کیلۆ گرام چێوەکەی ٦٥,٧٨ سم، ولیام تولینموود، لەساڵی ١٩٦٥ دا بەرهەمی هێنا.

## گەورەترین لیمۆی ترش

کێشی گەیشتە ٢,٨٣٤کیلۆ گرام و چێوەکەشی ٧٣سم بوو ئەوەی کە بەرێز کونوتزن لە کالیفۆرنیادا لەسەری نوسی دەلێت گەورەی لیمۆ کە بە بەراورد لەگەڵ سەری خاوەنە جوترایەکەیدا چوار بۆ یەك بوە.

## گەورەترین گێزەر

قورسییەکەی ٥ کیلۆ گرام بوو (پوپ ماکوان)ی خەڵکی فیکتوریای ئوستورالیا بەرهەمی هێناو لە ئەیلولی ساڵی ١٩٦٧ دا.

## گەورەترین تور

کێشی گەیشتە ١١,٣٢٥کیلۆ گرام، غلین تاکار لە ئوستورالیای باشور بەرهەمیهێنا لە ساڵی ١٩٧٤دا.

## گەورەترین خەیار

شەشە کیلۆ گرام بوو (جورج کوشیرا)ی تکساس بەرهەمیهێنا لە ساڵی ١٩٧٨دا درێژییەکەی ١٨٢سم بوو.

بەهێزترین زەمین لەرزە تا ئێستا لە وێنەی نەبوبێت ئەوە بوو لە ئایاری ساڵی ١٩٦٠دا دای لە (لیبۆ) لە باشوری (کوانسبسیۆن)ی شیلی پلەکەی گەیشتە ٩,٥ پلە.

## خراپترین زەمین لەرزە

ئەو زەمین لەرزەیە بوو لە هەرێمەکانی (شنی وشەنی) چیندا روویدا لە دووی شوباتی ١٥٥٦، کە گەورەترین زیانی گیانی لێکەوتەوە ئەویش کوژرانی ٨٣٠,٠٠٠ کەسی لێکەوتەوە، هاو شێوەی ئەم زەمین لەرزەیە لە ساڵی ١٩٧٦ لە سەعات ٣,٥ شەودا هەرێمێکی رۆژهەڵاتی چینی گرتەوە بوە هۆی کوژرانی ٧٥٠,٠٠٠ کەس، هێزەکەشی بە پەلی ٨,٢ پلە بوو.

## گەورەترین زەمین لەرزەی زیان بەخش

لەدەشتی کوانتۆی یاباندا روویدا لە یەکی ئەیلولی ١٩٢٣دا، بەهێزی ٨,٢ پلە ناو نرا (لەرزەی مەزن) لە ئەنجامیدا کەنداوی (ساغامی) دا بەزی، ژمارەی کوژراوان و ونبوانن و سوتاوان گەیشتە ١,٤٢٠,٨٠٧ کەس، هێندەماڵیشی لە تۆکیۆو یۆکۆهامادا روخاند کە ئەو کاتە بە ٢٨٠٠ ملیۆن دۆلار مەزەندە دەکرا.

## مەزنترین هەڵچونی ئاگرپژێن

سەرجەمی ئەو مەوادەی کە بورکانی (تامبورا) لە دورگەی (سامبوای ) ئەندەنوسیا فڕێیدا لە ساڵی ١٨١٥ بریتی بوو لە١٥٠,٦٥٣ کیلۆمەتری سێجا تیرەی لولەکەشی گەیشتە ١١,٢٦٣ کم.

## مەزنترین تەقینەوەی ئاگر پژێن

ئەو تەقینەوەیە بوو کە بووە هۆی هەڵچوونی (کارکاتو) ئەو دورگە زۆر بچوکە کە رووبەرەکەی ٧٤,٩٨٨ کم دوجایە، لەپێش نیوەڕۆی ٢٧ ئابی ١٨٨٣دا تەقیەوەو ١٦٣ دێی وێرانکردو بووە هۆی کوشتنی ٣٦٣٨٠کەس.

## مەزنترین ئاگر پژێنی بێدەنگ

بورکانی (لولا یلاکو) بوو لەسنوری نێوان شیلی و ئەرجەنتین بەرزییەکەی گەیشتە ٦٧٢٢,٩٧٣ مەتر لەسەر رووی دەریاوە.

## بەرزترین ئاگرپژێنی خێرا

بورکانی (ئەنتۆڤالا) بوو لەئەرجەنتین بەرزییەکەی گەیشتە ٦٤٥٠,١٧٧مەتر.

## بڵاوترین لولەی ئاگر پژێن

دەمی شاخی (ئاسۆ)یە کە بەرزییەکەی ۹۷ ۱۵۹۱ مەترە دەکەوێتە کیشوەری ژاپۆن پانتایەکەی لەباکورەوە بۆ باشور ەەگاتە ۲۷,۵۲ کم و لەرۆژهەڵاتیشەوە بۆ رۆژئاوا ۱٦,۹٤ کمو چێوەکەشی ۱۱٤,۲۳۹ کم.

## زۆرترین دا پۆشەری سەرزەوی

ئەو روبەری کە ئاو دایدەپۆشێت لەسەر روی زەوی بە۳٦۱۷٤۰۰۰۰ کم دووجا مەزندە دەکرێت واتە ۷۰,۹۲٪ی روبەری گۆی زەوی.

## گەورەترین زەریا

زەریایی ئارامە کە ٤٥,۱۸٪ روبەری زەریاکانی جیهان پێکدەهێنێت، بە ۱٦٥۱۷۸۲۰۰ کیلۆ مەتر دووجا مەزندە دەکرێت:

## قوڵترین تەختانی زەریا

لەساڵی ۱۹٥۱دا، کەشتی زەوی پێوەری بەریتانی (تشالنجەر) لە زەریای (هێمن)دا دۆزرایەوە، بەهۆی مەتری قولایەوە پێوایان، قوڵیەکەی گەیشتە ۱۰۸۹٦م.

## گەورەترین کەنداو

کەنداوی مەکسیکە کە درێژیی کەنارەکەی ٤٩٨٧,٩ کم لە (ئوراس سابل)ی فلۆریداوە دەستپێدەکات تا (کابرکاتوش)ی مەکسیک، رووبەرەکەشی ١٥٠١٥٥٦,٢ کم.

## بەرزترین شاخ لە ژێر دەریادا

لەساڵی ١٩٥٣ لە نزیک خەنەقی (ترنگابین)ی ساموا نیوزلەندەدا دۆزرایەوە بەرزییەکەی لە ناخی دەریاوە ٨٦٨٥,٨٠م لوتکەکەشی ٣٦٥,٧٦ م دەکەوێتە ژێر دەریاوە.

## بەرزترین شەپۆل

کەشتی (رامیاو)ی ئەمریکی پێوای لە گەشتێکی دەرياییدا لەشەوی ٦ –٧ شوباتی ١٩٣٣ لە کاتی زریانێکدا کە خێراییەکەی ١٢٥,٩٨٥کم بوو لە سەعاتێکدا، بەرزی شەپۆلەکەش ٣٤,١٣٥م بوو.

## گەورەترین دەریاچەی دەریایی ناوخۆیی

دەریایی قەزوینە لە باشوری روسیاو ئێراندا درێژییەکەی ١٢٢٢,٨٤ کم رووبەری گشتی ٣٧١٦٣٦,٥٩ کیلۆ مەتر دووجا.

بەڵام سازگارەکان گەورەترین روبەری هەیە دەریاچەی (سوبریور) (دەریاچە مەزنەکان)ە لە ئەمەریکای باکوردا، روبەری گشتییەکەی دەگاتە ٨٢٣٦٦٢ کم چوارگۆشە.

## روبارە گەورەکان

ڕووبارە گەورەکان چوارن: (جیجون و سیحون و دجلەو فورات).

جیجـون: روبـارێکی گەورەیـە زۆر لقـی لێدەبێتـەوە تـا دەگاتـە خـەواریزم. بـەلاّم سـیحون: ڕووبـارێکی مەزنـە لـەولاّتی تورکیـا دەسـتپێدەکات تـا دەگاتـە ولاّتـی تەتـەر، دجلـەو فـورات: لـە تورکیـاوە هەلّدەقولّێن دێن تا دەڕژێنە کەنداوەوە.

## روبارە بچوکەکان

روبـارە بـچوکەکان: روبارێـك هەیـە لـەنێوان بەسـرەو ئـەهوازدا دەلّـێن هەندێك جار ئاوەکەی بەرزدەبێتەوە دوای ئەوە هەشت سالّ نامێنێت و هـیچ کـەس شـتێك دەربـارەی نازانێـت، روبـارێکیش لـە یەمەنـدا هەیـە لـەکاتی رۆژهەلاّتـدا ئاوەکـەی لـە رۆژهەلاّتـەوە بـەرەو رۆژ ئـاوا دەچـێت لەکاتی رۆژئاوابونیشدا لە رۆژ ئاواوە بەرەو رۆژهەلاّت دەڕوات.

## درێژترین روبار

روبـاری نیلـە ئـەمجا روبـاری ئـەمازۆن، روبـاری نیـل دەڕژێتـە دەریـای ناوەراستەوە، روباری ئەمازۆنیش دەڕژێتە زەریای ئەتلەسی باشورەوە،

بەڵام هەموو ئەتڵەسکانی جیهان نیل بەدرێژترین روباری جیهان دادەنێن، درێژیەکەشی ٦٦٦٩,٢٠٥ کم.

## کورتترین روبار

روباری (D) (دی)یە لە شاری لینکولنی ئوریفون، درێژییەکەی ١٢١,٩٢م دەرژێتە دەریاچەی شەیتان (دنفییلن) لە زەریایی هێمن.

## گەورەترین روباری هەڵقولیو

روباری ئەمەزۆنە کە دەرژێتە زەریایی ئەتڵەسییەوە لەچرکەیەکدا ١١٨٩٢٧م٣ ئاوی لێ هەڵدەقوڵێت.

## مەزنترین تاڤگەکان

تاڤگەی (غوبیرا)یە کە بەرزییەکەی ١١٣,٩٩م لەسەر روباری (تربارانا)ی نێوان بەرازیل و پاراگوای لەچرکە یەکدا ١٣٣٠٥,٧ م٣ ئاوی لێ دادەبەزێت.

## بەرزترین تاڤگە (رێژاو)

تاڤگە (مەلاك)ە لە فەنزویلا لەسەر لقێك لەروباری کاراو کە بەرزترین لقی روباری (کارونی)یە بەرزییەکەشی ٩٧٩,٠١٧م.

## گەورەترین دورگە

دورگەی (گرینلاند)ە کە سەر بە شانشینی دانیمارکەو روبەرکەی ٢١٧,٤٧٦٠کم.

## بەرزترین شاخی بەفراوی

شاخێکی بەفراویە لەرۆژ ئاوای گرینلاند بەرزییەکەی ١٦٧٠٦٤م و لە ساڵی ١٩٥٨ لەلایەن بەفر ڕامالی ئەمریکی (ریستەوند)ەوە دۆزرایەوە.

## ئاسمان باڵندەو تیمساحی بچوك دەبارێت!!

مرۆڤ لەسەر ئەوە راهاتووە کە لەئاسمانەوە باران دەبارێت، هەندێك جاریش ئەو بارانە بە شێوەیەکی وا زۆر دەبارێت لافاو دروست دەکات‌و زیانی لێدەکەوێتەوە، بەڵام رانەهاتوون بەوەی ببینن لەئاسمانەوە هەندێك جار باڵندەو ماسی ببارێت!! ئەم روداوە لەفەرنسا رویداوە لەساڵی ١٨٤٦ دا لەناوچەیەکی زۆر لەفەرەنسا بارانی سور باریوە لەگەڵ چۆلەکەی مردوو نیوەگیاندا. زانایان هیچ روونکردنەوەیەکیان لەو بارەیەوە نەدا.

## ئاسمان باران و ماسی دەبارێنێت

بارینی ماشی لەگەڵ باراندا شتێکی باوەڕ نەکراوە، بەڵام ئەمە باوەڕپێنەکراوە لەشاری (دالاس)ی ویلایەتی (تکساس)دا روویدا لەرۆژی ١٨ی تەمەزی ١٩٥٨دا، کاتێك مارتا بروملی تەمەن ٩ ساڵان و بریارە ولیامزی تەمەن ١٠ ساڵە سەیریان کرد ماسی لە ئاسمان دەبارێت هێندە باری تا گەیشتە چل ماسی.

درێژی ماسییەکان لە نێوان ١٠ تا ١٥ سم بوون و رەنگیان خۆڵە مێشییەکی تێربوو، لەسەر لاشەیان چەندین خاڵی سور بەدیدەکرا، نوسینگەی زانینی کەش و هەوا لەدالاسدا ناچاربوو روونکردنەوەیەك بۆ ئەو دیاردەیە پێشکەشبکات، وتی: ئەو ماسیانە دەبێت زریانی هەورە تریشقەیی لەگەڵ خۆیا هەڵی گرتبێت و هێنابێتی لەو شوێنەدا بارانبێتی، بەڵام خەڵکی ئەو تەفسیرەیان قبوڵ نەکردو بەلاوازیان زانی.

# سەمەرەکانی کیشوەرەکان

بەڵگەکان هەموو ئەوە دەسەلمێنن کە گۆی زەوی سەرەتا بریتی بووە لەیەك کیشوەر، کە روبەرەکەی ٢٠٧ ملیۆن کیلۆمەتری دوجا بووە، بەڵام لە ١٠٩ ساڵ لەمەو پێشەوە، دابەشبووە بۆ دوو کیشوەری مەزن یەکەمیان بریتی بووە لە(لوراسیا) کە (ئوراسیاو گرینلاندو ئەمەریکای باکور گرتۆتەوە )، دوەمیشیان بریتی بووە لە(گوندو ئەنالاند)کە (ئەفریقیاو دورگەی رۆژئاوای هیندو ئەمەریکای باشور ئۆقیانوسیاو ناوچەی جەمسەری باشوری گرتۆتەوە).

# گەورەترین کیشوەر

وازانراوە کە وشکانی ٢٨,٠٨ سەر زەوی دەگرێتەوەو، پارچە زەوییەك کەپێی دەوترێت ئوراسیا گەورەترینیەتی، روبەرەکەی لەگەڵ دورگەکاندا ٥٤٥٠٦٢١٧ کم.

# بچوکترین کیشوەر

کیشوەری ئوستورالیایە کە روبەرەکەی ٧٦١١٦٦٠ کم.

# بەرزترین شاخ

لوتکەی رۆژهەڵاتە لەچیای هیمالایا کە بەرزییەکەی ٨٨٤٧,٧٣٤ م لەسەر روی دەریاوە، دەکەوێتە نێوان تبت و نیپاڵەوە.

## گەورەترین بیابان

بیابانی گەورەی ئەفریقیایە لەرۆژهەلاتەوە بۆ رۆژئاوا ٥١٤٨,٨ کم درێژە، پانیەکەشی لەباکورەوە بۆ باشور لەنێوان ١٢٨٧,٢ و ٢٢٥٢,٦ کم دایە.

## گەورەترین ئەشکەوت

گەورەترین زنجیرە ئەشکەوت لەجیهاندا ئەو ئەشکەوتانەن کە دەکەونە ژێر ئەشکەتی (مەئمون)ەوە لەباخچەی ئەشکەوتە سروشتیەکانی کۆنتاکی، لەسالی ١٧٩٥دا دۆزرایەوەو درێژی رۆشرەوەکانی ١٩٠ و ٣٠٦کم.

## درێژترین تەپۆلکە ( بەرزی )

درێژترین تەپۆلکە لەجیهاندا ناسراوە (تەپۆلکەی مەزن)ە لەئەشکەوتی (ئاڤن ئەرماند) لەلویزری فەرەنسا کە بەرزیەکەی ٢٩٠٨٧ م لە ناو ئەشکەوتەکە لەئەیلولی ١٨٩٧ دا دۆزرایەوە.

## درێژترین نزمی

درێژترین نزمی لەجیهاندا، ستونێکە بەدیوارێك پشتی گیراوە، درێژیەکەی لەبنچینەوە تازەوی ئەشکەوتەکە ٥٩,٤٣٦م ئەویش ئەشکەوتی (کویڤادی بنرجا)یە لەئیسپانیا.

## بەرزترین تاقی سروشتی

تاقێکی سروشتیە لەبەردی لمی دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای (چین)ەوە بەرزییەکەی بە ٣٠٤,٨م مەزەندەدەکرێت.

## فراوانترین چاڵ

چاڵی (ئەلفراندکانیون) ە لەسەر روباری کولورادو لەباکوری ئەریزوناوی ناوەندی، روبەرەکەی ٣٤٩,١٥کم، پانیەکەی لەنێوان ٦,٤٣٦ بۆ ٢٠کم، قوڵیەکەشی دەگاتە ٢١٣٣,٦م.

## قوڵترین چاڵ

قوڵترین چاڵ چاڵی (هیل)ە بەچاڵی دۆزەخیش ناودەبرێت کە ئاریگۆن و ئۆهایۆ لەیەك جودا دەکاتەوە لەچیای شەیتانەوە بۆ روباری مار قوڵتر دەبێتەوە بۆ ٢٤٠٧,٩٢م.

## قوڵترین چاڵ لەژێر ئاودا

چاڵێکە قوڵیەکەی ٩٦٤٥ مەترەو پانیەکەشی ٣٢,١٨٠ کم، دەکەوێتە نزیك ئوسترالیای رۆژ ئاواوە.

## گەورەترین جیاوازی پلەی گەرما لەرۆژێکدا

٥٥ پلەی سەدییە، لەرۆژێکی ساڵی ١٩١٦ دا لەمۆریتانیادا کە پلەی گەرما ٦,٧ پلەی سەدی بۆ دابەزی بۆ ٤٨,٨ پلەی ژێر سفر.

## گەرمترین هەسارە

هەسارەی خۆرە کە گەرمی ناوەوەی بە (١٦٠٠٠٠٠٠) یەکەی گەرمی رەها (کلڤین) مەزەندە دەکرێت و، نزیکەی ٤٥٠٠٠٠٠ تەن هایدرۆجین لەچرکەیەکدا، بەکاردەبات، لەئینجێکی چوارگۆشەدا ئەوەندەی ١٥٠٠٠٠٠ (شمعە) تیشك دەبەخشێت، قەبارەی خۆر بەرامبەر ٩٩٪ ڕێژەی گشتی سیستەمی خۆریە.

## گەورەترین هەسارە

هەسارەی (موشتەریە) تیرە ئیستوائیەکەی ١٤٢٨٤٧,٠٢ کم و تیرە جەمسەریەکەشی ١٣٣٥١٤,٨٢ کم، قەبارەشی ٣١٧١٨٣جار لەقەبارەی زەوی گەورەترەو، گەورەیەکەشی ١٣١٨ جار لەزەوی گەورەترە.

## بچوکترین هەسارە

هەسارەی بلۆتۆیە پلەی گەرمای سەرڕوی پلۆتۆ بە ٢١٧,٧٧٧ پلەی سەدیە ماوەی سوڕانەوەشی ٢٤٨,٥٤ ساڵە، تیرەکەشی ٣٠٢٤,٩٢ کم.

## نزیکترین هەسارە لەزەویەوە

هەسارەی زوهرە (ناهید)ە هەندێکجار لەمەداری زەوی نزیک دەبێتەوە بۆ ٣١٣٣٥١٣٠٠کم.

## درێژترین رۆژ

ئەو هەسارەیەیی کە درێژترین ماوە بە دەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، هەسارەی زوهرەیە کە بە ٢٤٣,١٦ رۆژ جارێك دەبات.

## خێراترین هەسارە

هەسارەی (عەتارد)ە کە بەدەوری خۆردا ٥٧٨٩٦٧٠٢,٥٥ کم دەبڕێت لە ٨٧,٩٦٨٦ رۆژدا.

## کۆنترین موشەك

کۆنترین موشەك لەجیهاندا ئەو موشەکە بوو کە لەئەوروپادا بەهۆی هاڕاوەی بارودەوە تەقاندیانەوە لەساڵی ١٢٥٨دا.

## یەکەمین موشەك

ئەو موشەکە بوو کە بەهۆی گازی شلەوە تەقێنرا دکتۆر (رۆبرت جوردان) (١٨٨٢ – ١٩٤٥) لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا دورستیکرد، لەرۆژی ١٦ ئازاری ١٩٢٦دا لەئویورندا تەقێنرایەوە ١٢,٤٩٦م بەرزبووەوەو ٥٦,٠٨٢م تریش رۆیشت.

# بەهێزترین موشەك

(ساتۆرن) کە لەبەرنامەکانی ئەپۆلۆو سکایلاب-دا بەکارهێنراوە درێژییەکەی ١١٠,٨٧٤٢م و قورسیەکەشی ٨٢ و، لەهەر چرکەیەکدا ١٥ تەن وزەی پێویستە بۆ پاڵنانی ماوەی رۆیشتنیشی ٢,٥ خولەکە، واتا (٢٢٥٠) تەن وزەی دەوێت تا بگاتە شوێنی مەبەست.

## سەمەرەکانی گەلی مەغۆل

گـەلی مـەغۆل بەسـەیرترین گـەلانی دونیـا دادەنرێـت، نەتەوەیـەکی گەڕۆکن بەسروشت زۆر حەزیان لەگەرانەو، بەناوبانگن لەئەسپسواری‌و سوارچـاکیدا لەسـەدەی سـیانزدەو هـەموو چـواردەهەمدا لەچـین‌و هیندسـتان دەژیـان،، بارودۆخیـان تێکـچوو دوای ئـەو جەنگانـەی کـە بەناوبانگ بـوون تیایـدا لەسـەدەکانی ناوەراسـت بـەڵام ئێسـتا گـەلێکن خەریکی ئاژەڵدارین‌و لەهاماریەکانی مـەنگۆلیادا لەناوەراسـتی ئاسیادا دەژین‌و خەریکی ئاژەڵدارین لەنەریتە سەیرەکانیان شوانەکانیان لەکاتی لەوەڕانـدنی مێگەلـەکانیان سـواری وڵاخ دەبـن‌و دارێکـی درێـژ بەکاردەهێنن لەکاتی لەوەراندنی ئاژەڵەکانیاندا لە ڕم دەچێت.

## سەمەرەکانی گەلی ئەسکیمۆ

بەخێڵـەکانی ئەسـکیمۆ دەوترێـت (ئەسـکیۆی ئـاو — خـوێ) لـەنزیکی کـەنارەکانی نیـشتەجێن و بـۆ راو بەلـەمی زۆر سـوك بـەکاردەهێنن لەپێستی ئەو ئاژەڵە ئاویانە دروستی دەکەن کە راویان دەکەن.

ئەگـەر راویـان زۆرکـرد قـازانجی باشـیان دەسـتکەوت ئـەوا گۆشـتی شـیری دەریـا دەخـۆن لەپێـستە کەشـی بەلـەم دروسـتدەکەن بـۆ ئـاوە سویرەکان بەکاریـدەهێنن هەرچیش لەگۆشتەکەی مایـەوە لـەناو بـەفردا دەیبەسـتن‌و دوای ئـەوە دەیخـۆن لـەکاتی برسـێتیدا،، ئەسـکیمۆ کـچە بـچکۆلەکانیان دەکـوژن، پـیرە ژنـەکانیش پـشتگوی دەخـەن تاخۆیـان

دەمرن بۆ ئەوەی گۆشتەکەیان بخۆن، لەنەریتەکانیان کاتێك دوانیان یەکتر دەبینن لوتیان لەیەك دەدەن وەك نیشانەیەکی خۆشەویستی.

## سەمەرەکانی هۆزی ( تەوارق )

تەوارق هۆزێکن لەرەگەزدا بەربەرن، شوێنی نیشتەجێبونیان لەلێوارەکانی ئەفریقای باکورەوە تا ناوەراستی بیابانی گەورە لەباشوردایە، پیاوەکانیان بالآیان مامناوەندییەو دەمو چاویان درێژۆلکەیەو زمانێکی تایبەتی بەخۆیان هەیە پێی دەوترێت (تینیار) لەنەریتە سەیرەکانیان، پیاوەکانیان سەرو دەمو چاویان دادەپۆشن تەنیا چاویان بەدەرەوەیە. لەکاتێکدا ژنەکانیان سەریان روتە، قەلغانەکانیان لەپێستی ئاسك دروستدەکەن و زۆر سوارچاکن و تائێستاش بۆ گواستنەوە ولاغ بەکاردەهێنن، هەندێکیشیان لەبیابانی لیبیادا دەژین.

## سەیرو سەمەرەکانی خێلەکانی جفسە لەتونس

ژنانی هۆزی جفسە لەتونسدا هەندێك دابونەریتی سەیریان هەیە، لەوانە خۆیان دەرازێننەوە بەخشلو زۆریش پێوەی دەنازن، بەلام ئەو خشلانە لەزێر دروست نەکراوە، بەلکو لەشاخی بزن و شوشەو توێکلی هێلکەی وشتر مورغ دروستکراوە، لەنەریتە زۆر باوەکانیان قژو نینۆنکیان زۆر درێژدەکەن و پێستی خۆیان لەخەنە دەگرن، بەمجۆرە

بەخۆیاندا دەنازن لەپێش چاوی ژنان و پیاوانی هۆزەکەیان بە ئومێدی شوکردن.

## ژنی هیندی لای هندییە سورەکان

لەهەموو دونیادا دایك هەر دایکە.. تەنانەت لەجیهانی ئاژەڵانیشدا دڵی بۆ کۆرپەکەی دەهێنێت و لەپێناویدا خۆی بەکوشت دەدات.

لەنەریتەکانی ژنانی هیندیە سورەکان، دایك کۆرپەکەی زۆر بەتوندی بەتەختەدارو پەت دەپێچێتەوەوبۆ ئەوەی جوڵە نەکات لەوەش سەیرتر بەتایبەت ئەو هیندیانەی لەئەمەریکای باشور نیشتەجێن ئەگەر یەکێکیان منداڵی بوو لەماوەی زەیستانیدا لەجێگەدا ناکەوێت، بەڵکو منداڵەکانی بەجێدەهێڵێت و مێردەکەی لەشوێنیدا دەخەوێت بەمەبەستی فریودانی گیانە شەڕانییەکان بۆ ئەوەی خۆی و منداڵەی ئازار نەدەن یان زیانێکیان پێ نەگەیەنن.

## گەلی کەنداوی بەنگالی ئەرخەبیل

لەکەنداوی بەنگالی ئەرخەبیل دورگەیەك هەیە پێی دەوترێت (ئەندەمان) دانیشتوانەکەی خەڵکانێکی سەرەتایین و لەرەگەزدا لەزنجییەکانی ئەفریقان لەسەرکۆکردنەوەی میوە دەژین وەکو دانیشتوانی دارستانەکانی ئەمازۆن، خەڵکێکی گەڕۆکن و لەکوخی بچوکی لەدار دروستکراودا دەژین کە ستونی هەیە.

دابونـەریتی سـەیریان هەیـە" ئێسکی بـاو باپیرانیانیـان بـە بنمیـچی کوخەکانیانەوە هەڵدەواسن بۆ پیرۆزی و ڕێزلێنانیان دەستێکی باڵایـان هەیـە لـەراودا، بـەڵام لەتیروکـەوان زیـاتر هیـچی تـر بـەکارناهێنن لەراوکردناندا.

لەوە سەیرتر کاتێك لەکوخەکانیاندا دەخـەون یان دادەنیشن ئێسکی باو باپیرانیان دەخەنە ژێر یان خۆشیان روتدەکەنەوە بۆ ئـەوەی ئێسکی باپیرانیان جۆشی بدرێتە ئێسکی خۆیانەوە.

## سەمەرەکانی دابونەریتی ژنانی مەدەغەشقەر

ژان لەهـەر کوێیـەکی ئـەم دونیایە دابن لەخۆشەویستی و رقدا لەیـەك دەچـن تەنانـەت لـەکاتی غەمباریـشیاندا، ئەگـەر ژنێـك مێردەکـەی لەدەستبدات بۆی دەگریـت بـەپێی ئـەو خۆشەویستییەی بـۆی هـەبووە هەندێکیان سنگی خۆیان دادەڕن هەندێکیشیان خۆیان لە قوڕدەنێن.

بـەڵام نـامۆترین نـەریتی غـەمباری لای ژنـانی مەدەغەشـقەر لـەکاتی پرسەدا ئەوەیە ئـەو ژنـەی مێردەکـەی مـردووە قـژی دەکاتـە دولەتـەوەو وەکو دوباڵی لێدەکات و هەردوو چاوی لێکدەنێ و دەمی دادەخات بەناو ژنانی تردا دێت و دەچێت و قسە لەگەڵ کەسدا ناکات ئەگەر قسەشی لەگەڵدا بکەن وەڵامیان ناداتەوەو دەوروبەریشی ڕێزی ئـەو غەمبارییـەی دەگرن و قسەی لەگەڵ ناکەن.

## سەمەرەکانی ژنانی غینیای تازە

لەغینیای تازە کاتێک مێردی ئافرەتێک گەنج دەمرێت، دەبێت پابەندبێت بەماوەی پرسەکەیەوە لەدیاردەکانی پرسە لای ژنان دەبێت هەندێک لەئەندامانی لەشی بەپریشانی روەك دەبەسنەوە تا هێزو بەرگرییان بداتی و پەتێکیش لەلوتی ژنی مێر مردووەکە دەبرێتەوە ژورەوە مەبەستیش لێی ئەوەیە لەکاتی هەناسەداندا گیانی شەڕانی نەچێتە ناو لەشیەوە.

## نەریتی خێڵەکانی باشوری سودان

لەیەکێك لەگوندەکانی باشوری سوداندا کە کەوتۆتە سەر روباری (قۆڵتا) خێڵێك لەخێڵەکانی سودان دەژین، ئەندامانی بڕوایانوایە کە بتەکان هێزێکی ئەفسوناوی شاراوەیان تێدایە، بۆ ڕاوەدونانی جنۆکەکان و دروخستنەوەیان لەئازاردانی لێقەوماوان و جێبەجێکردنی هەموو داواکاریەکانیان بەهۆی ئەو پەیکەرانەوە.

کاتێك کەسێکیان توشی کارەساتێك دەبێت بەچیچکانەوە لەبەردەم ئەو پەیکەرە لەدار دروستکراوەدا دادەنیشێت کە بەشێوەیەکی زۆر سەیرو سەمەرە دروستکراوەو لێی دەپاڕێتەوەو داوای لێدەکات تا دڵی پێی بسوتێت و بەزەیی پیابێتەوەو لێی رازی بێت.

## سەمەرەکانی خێڵەکانی روباری ئوبانچی

لەسەر روباری ئوبانچی لەناوچە لەبیرکراوەکانی ئەفریقای ئیستیوائیدا خێلێك دەژین لەسەر شێوەی ژیانی نەتەوە کۆنەکانی پێش مێژوو.

خێڵەکانی ئوبانچی بڕوایانوایە زەوی موڵکی هەموانەو جیاوازی نیە لەنێوان ئەم و ئەودا، هەموو پێکەوە دەیکێڵێن و دەیدورنەوە، دوای ئەوە سەر گەورەی خێڵە کە پێی دەوترێت (گەورەی زەوی) هەموو تێشووە لەدار دروستکراوەکان دابەشدەکات بەسەریانداو فەرمانی دەستبەکاربوون دەدات، خۆیشی چاودێریان دەکات لەرۆژی دروێنەکردنیشدا هەمانشت هەموو کۆدەبنەوەو دەسندەکەن بەدروێنەو هەموو بەرهەمەکە لەچێوەی بازنەیەکدا کۆیان دەکاتەوەو بەپێی سەری خێزانەکان بەبێ جیاوازی بەروبومەکەیان بەسەردا دابەش دەکات بەو جۆرە هەموو بەتێری و بەمێشك ئاسودەیی لێی دەنون.

## سەمەرەکانی خێڵەکانی زوەندەو زنجی

لەناو زنجیەکانی ئەفریقیادا خێڵێك هەیە بەناوی زەند جادوباز تیایاندا رێزێکی تایبەتی هەیە، لێی دەترسن و ملکەچی دەکەن بێ کۆم کردنەوە. سالآنە لەکاتێکی دیاریکراودا جەژنێکیان هەیە کە مرۆڤێك تیایدا دەکەنە قوربانی بۆ خوایەکەیان بۆ ئەوەی گیانە شەڕانیەکانیان لێ دوربخاتەوەو، لێیان رازی بێت و بیانپارێزێت و بەروبومی زەویان زیادبکات، لەو رۆژەدا بەژن و پیاو و مندالّو پیرەوە لەبازنەیەکی خڕدا دەوەستن، تەپلّ لێدەدرێت، کە هێمای بانگکردنی جادوبازەکەیە ئەویش ئامادە دەبێت پەری بالّندە دەکاتە سەری خۆیدا، هەندێك وێنەی سەیر

لەدەمو چاو قاچەکانی دروستدەکات پارچەیەك قوماش دەبەستێتەوە هەردوو باڵیەوە کە چەندین پارچە ئاسنی پێوەیە، دوو بازنیش دەکاتە هەردوو مەچەکی، جادوبازی تۆقێنەری ترسناك دێتو دەوەستێتو لەسەر ئاوازی تەپڵەکان چەند قسەیەك دەکات کە هیچ کەس لێی تێ ناگات، پاشان پەنجە رادەکێشێت بۆ قوربانییە داماوەکە، ئەوانیش سەری دەبڕن بەمەبەستی رازیکردنی خودای نەزانیان.

## گەلەکانی ناوچەی باشووری لەتۆمبکتۆ

لەناوچەی باشوری رۆژهەڵاتی شاری تۆمبکتۆ خەڵکی وا ناوبانگیان دەرکردوە کە (تیمساح پەرستن) بۆ رێزلێنان لەو خواوەندە دەمامکێك دەپۆشن لەدەمو چاویان لەو تیمساحە دەچێت، بۆ رێزلێنان لەو خوایەیانو بەپیرۆز زانینی نەگۆشتەکەی دەخۆن نەهێلکەکەی،، هەژارەکانی ئەم خێڵە لەکوخدا دەژین، بەڵام گەورەکانیان لەکوخێکدا دەژین کە لەقوڕ دروستکراوە.

## نەریتەکانی خێڵەکانی (ئالیۆ)ی چین

لەشاخەکانی ئاسایدا خێڵێکی بەدابونەریت سەیر دەژین" ناویان (ئالیمۆ)یە لەبنەچەکدا لەچیندا ژیاون، پێش ئەوەی کۆچ بکەن بۆ تۆنکین کە تا ئێستاش لەوێدا، خەڵکی ئەو ناوچەیە بەگشتی باڵایان کورتەو پێستیان زەردە، وا باوە ژنەکانیان لەکاتی خۆشیدا سەرپۆشی زۆر گەورە دەپێچنە سەریانەوە لەکەژاوەی سەری حوشتری بیابان

جیهان

دەچێت سەر سینگیشیان قایشێکی بازنەیی لەپەڕدروستکراو دەبەستن،، لەگەڵ کراسێکی لەبەلّم دروستکراودا، لەشێوەی ئەو کراسانە دەچێت کە کچانی ئەمڕۆ لەبەری دەکەن.

## سەرسوڕهێنەرەکانی جلوبەرگ

لەگوندی (باتاك) لەدورگەی سۆمەترەی ئەندەنوسیا لەناوچەی ئیستیوائیەکاندا خەڵکانێك دەژین لەنزیکی دەریایەك ناوی (تۆبۆ)یە زۆر هەوڵ بۆ رازیکردنی گیانی مردوان دەدەن، چونکە بڕوایانوایە گیانی مردو بەرەکەت نارژێنێت ئەگەر قوربانیو قۆچی بۆ نەکەن. ئەویش لەترس رازیکردنی گیانی مردوەکەدا دەیکەن تا توشی تورەبونی نەبنو نەخۆشیو کارەساتیان بۆ رەوانە نەکات، دانیشتوان سورن لەسەر ئەوەی بەکۆمەڵو بەتەنیا بڕۆنە سەر گۆڕەکانو هەریەکەو دیارییەك لەگەڵ خۆیدا بەرێت بۆ ئەوەی پێشکەشی گیانی مردوەکەی خزمی بکات بەبێ دەنگیو ملکەچییەوە دادەنیشێت بەتەنیشت گۆڕەکەوەو دەست دەکاتە گریان و پاڕانەوە تادەگاتە ئەو قەناعەتەی گیانەکە لێی رازیبووە، ئەمجا ئەو شوێنە بەجێدەهێلێت، نەوەك گیانەکە پەشیمان بێتەوە لەقسەی خۆیوتوشی دەردەسەریو زایەکی بکات.

## جلوبەرگ لای ژنانی ( یۆرنیۆ )

سەیرترین جلوبەرگی ژنانی ئەفریقیا بگرە هەموو جیهانیش جلوبەرگی ژنانی (گەلی دایك)ە کە لەشاری (یورنیۆ) نیشتەجێنو

بەخێلێکی زۆر سەرەتایی دادەنرێن، پیاوەکانیان لەکۆندا بەسەربڕینی خەڵك بەناوبانگبونە، بڕوایان وا بووە" هەر کەسێکیان پیاوێك لەدوژمن بکوژێت، ئەوا لەو دونیادا ئەو کەسە دەبێتە خزمەتکاری، لەگەڵای دار جلوبەرگی خۆیانیان دروستکردوە، بەشێوەیەك دروستیانکردوە ئەو گەڵایە وشك نەبۆتەوە، ژنانیشیان لەگورزە قامیش و روەك کە لەسەریەك دایان ناوە جلوبەرگیان بۆ خۆیان دروستکردوە، ژنەکانیشیان قژیان بۆ دواوە شانە کردوە، کچە دەستگیران دارەکانیشیان قژیان بۆ سەروە لولداوە.

## پەرستگەیەك لەمس

لەچین-دا سێ ئاینی رەسمی هەیە کە لەگەڵیەکدا دەژین ئەوانیش ئاینی (کۆنفۆشیوس ئاینی بوزی و ئاینی تاویە) بەناوبانگترینی پەرستگەی چین پەرستگەیەکی لەمس دروستکراوە کە ناوی (کنتین)ە لە نزیك شاری یون -تان- خۆبی پایتەختی هەرێمی یۆن -نان- ئەوشارەش لەسەر بەرزییەکە کە ٢٠٠٠م لەسەر رووی دەریاوە بەرزترە.

## درێژترین جەنگ

جەنگی سەد ساڵەی نێوان بەریتانیاو فەرەنسا بو کە لەساڵی ١٣٣٨ دەستیپێکردو لەساڵی ١٤٥٣ کۆتایی هات واتە ١١٥ ساڵی خایاند.

## کورتترین جەنگ

ئەو جەنگە بوو کە لەنێوان بەریتانیاو (زەنجەبار) کە ئێستا بەشێکە لە تەنزانیادا رویدا لەسەعات ٩,٠٢ دەستیپێکردو لەسەعات ٩,٤٠ کۆتایی هات لەپێش نیوەڕۆی ٢٧ی ١٨٩٦ بەمەبەستی ئاگادارکردنەوەی سوڵتان سەعید خالد کە خۆیکردبووە فەرمانڕەوای زەنجەبار، بەڵام سوڵتان ئامادەنەبوو لەسەر کورسی حوکم دابەزێت، بۆیە کەشتیگەلەکانی ئینگلیز کۆشکەکەیان تۆپباران کردو لە ماوەی تەنها ٣٨ خولەکدا داگیریان کرد.

## زۆرترین قوربانی جەنگ

جەنگی جیهانی دووەم بوو (١٩٣٩ – ١٩٤٥) ژمارەی قوربانیەکانی لەسەر بازو مەدەنی هەموو وڵاتانی دونیادایە ٥٤٨٠٠٠٠٠ کەس مەزەندە کراوە لەوانە ٢٥,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆنی لەچین و، وڵاتێك کە زۆرترین زیانی لێکەوتبێت پۆڵەندا بوو کە ٦٠٢٨٠٠٠ کەسی لێکوژرا کە دەگاتە ٢٢,٢٪ سەرجەم دانیشتوانی کە ژمارەیان ٢٧٠٠٧٠٠٠ کەسە.

## زۆرترین زیانی جەنگ

جەنگی جیهانی یەکەم بو کە لەیەکی تەمووز بۆ ١٦ تشرینی دوەمی ساڵی ١٩١٦ بەردەوام بو ژمارەی قوربانیانی ١٠٣٠٠٠ کەسبوو کە ٢١٤١٠٥ کەسیان ئینگلیزو فەرەنسی و ٤٢٠٠٠٠ کەسیان ئەڵمانی بوون.

## هەرێمەکان

تاسەرەتای ئابی ١٩٨٠ (٢٢٤) هەرێم هەبوون کە لەلایەن ئیدارەی تایبتەوە بەرێوە دەبران، لەوانە ١٦١ وڵاتی سەربەخۆ، ٨١ وڵاتی دورگەیی ٣٩٢ وڵات خاوەنی سەروەری خۆیبووە، ٢٤ یشیان سەروەریان نەبووە، ٢٩ وڵاتیش سنوری دەریاییان نییە.

## گەورەترین وڵات لەروبەردا

کۆمارەکانی سۆڤیەتی پێشوو بور کەژمارەیان ١٦ کۆماری یەکگرتوو بوون، روبەری هەموویان ٢٢,٣٩٢,٦٩٠ کیلۆمەتر دووجا واتە ١٥٪ی سەرجەم روبەری وشکانی، سەرجەمی لێوارەکانی و دوورگەکانی ١٠٦٣٣٨ کم بوو نێوانی لەرۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوای وڵات ٨٩٨٧,٢٢ کم و لەباکورەوە بۆ باشووریش ٤٤٨٩ کم.

## بچوکترین وڵاتی سەربەخۆ

وڵاتی ڤاتیکانە کە لەناو شاری رۆمادایە کە روبەرەکەی تەنیا ٤٤٠,١٠٤م٢ یە.

## بچوکترین کۆمار

کۆماری (نۆرۆ)یە کە یەك پلە دەکەوێتە ژێر هێڵی ئیستیواوە لەزەریای ئارامی باشورە، لە ٣١ کانونی یەکەمی ١٩٦٨دا سەربەخۆیی وەرگرت و ژمارەی دانیشتوانەکەی بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٧٦ هەشت هەزار کەس بووەو روبەرەکەی ٢١,٣٠٨,٨٣٤م٢ یە.

## وڵاتێك زۆرترین سنوری خاکی هەبێت

وڵاتی چینە کە لەگەڵ ١٣ وڵاتی سنوری خاکی هەیە ئەوانیش ئەم وڵاتانەن (مەنغۆلیا، یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، کۆریایی باکور، هۆنگ کۆنگ، ماکاو، ڤێتنام، لاوس، بۆرما، هیندستان، بۆتان، نیپال، پاکستان، ئەفغانستان).

## درێژترین سنور

سنوری نێوان کەنەداو ویلایەتە یەکگرتوەکانەکە ٦٤١٥,٠٨٣ کم درێژە.

## زۆرترین دانیشتوان

زۆرترین ژمارەی دانیشتوان لەوڵاتی چینە کە ژمارەی دانیشتوانی لە ١,٢٥٠,٠٠٠٠٠٠ زیاترە.

## کەمترین دانیشتوان

ولاتی ڤاتیکانە ژمارەی دانیشتوانی لە ساڵ ١٩٧٧ دا ٧٢٣ کەس بووە.

## کۆنترین پایتەخت

شاری دیمەشقی پایتەختی کۆماری سوریایە، لە ٢٥٠٠ ساڵ پێش زاینەوە تا ئێستا ئاوەدانە وشەی دیمەشق لەزمانی عەرەبیدا واتە پەلەکردن، واتا پەلەیان کردوە لە دروستکردنیدا دەڵێن جێرۆزی کوڕی سەعدی کوڕی عادی کوڕی سام-ی کوڕی نوح دروستیکردووە، ئیبراهیم (علیە السلام) پێنج ساڵ دوای دروستکردنی دیمەشق لەدایکبووە.

## کۆنترین شار

شاری ئەریحا، بە کۆنترین شاری مێژوو دادەنرێت، ژمارەی دانیشتوانی لە ٧٨٠٠ ساڵ پێش زاییندا سێ هەزار کەسبووە.

## قاهیرەکان

لەسەرانــــسەری جيهانـــدا ١٨ شـــار هەيـــە كـــەناوی قـــاهيرەی هەڵگرتووە،سيانزە شاری لەويلايەتە يەككگرتوەكانی ئەمەريكايەو دوو شاريش لەكەندايەو دوو شاريش لەئيتاليايەو شارێكيش لەفەرەنسايە، جگە لەقاهيرە يەكەمی پايتەختی ميسر.

## بەرزترين زيادكردنی سروشتی

٢٩٠١ كەس بوو لەهەر هەزار كەسداگەولاتی سوريا ساڵی ١٩٧٥، بەلاّم لەهەموو جيهاندا رێژەكە بريتييە لە ١٨،١ كەس لەهەزار كەسدا.

## كەمترين زيادكردنی سروشتی دانيشتوان

لەولاّتی ئەڵمانيا بوو كە گەيشتە (-٢) لە هەر هەزار كەس لەساڵی ١٩٧٧دا، واتە لەدايك بووان بەرێژەی ٩٥٪ و مردوان بەرێژەی ١١،٥٪ بوو.

## ژن هێنان

هينديیەكان بەرێژەيەكی گشتی پياوان لە ٢٠ ساڵی و كچان لە١٤،٥ شو دەكەن لە ئێرلەندەدا پياوان لە ٣١،٤ و كچانيش لە٢٦،٥ ساڵيدا، لە كۆماری چين پياوان لە ٢٨ ساڵی و كچان لە ٢٥ ساڵيدا زەواج دەكەن.

## تەڵاق

زۆرترین ڕێژەی تەڵاق لەدنیایدا لەئەمەریکادایە، ژمارەی روداوی تەڵاق لەساڵی ۱۹۷۷ دا گەیشتە ۱۹۰۰۰۰ واتە ٥٠,۹۰٪ ژمارەی ژنان.

## گەورەترین نەخۆشخانە بۆ نەخۆشیە ئەقڵیەکان

نەخۆشخانەی pilgrim state hospital لەنتۆدی رۆژئاوای نیویۆرك کە ۳۸۱٦ سەرینی تیایە.

## نەخۆشخانەیەك زۆرترینِ منداڵی تێدا بێت

نەخۆشخانەی momogemoیە لە جەزائیر لە ساڵ ۱۹۷٦ ٤١٩٢٠ منداڵی تێدا لەدایکبووە نەخۆشخانەکە ٥۹۹ سەرینی تێدایە، تەنیا لەیەك رۆژدا ۱۷٥ منداڵ تیایدا لەدایکبووە بەمەش رێکۆردی جیهان شکاند.

## دریژترین مانەوە لەنەخۆشخانەدا

۹۹ ساڵ بوو کە (مارتا ولسون) لە نەخۆشخانەی ئەقڵی شاری ئۆهایۆدا گوزەراندی لە ساڵی ۱۸۷٥ بردیانە ئەو نەخۆشخانەیە وە لە کانونی یەکەمی ۱۹۷٥ تیایدا کۆچی دوای کرد لە تەمەنی ۱۰۳ ساڵ و شەش مانگیدا.

## کەمترین ڕێژەی پزیشك

وڵاتی (ڤولتایی سەروە) ژمارەی پزیشکەکانی تەنیا ٥٨ پزیشك بوو واتە یەك پزیشك بۆ هەر ٨٢٧٥٩ نەخۆش لە ساڵی ١٩٧٠دا.

## وڵاتێکی بێ پزیشك

سوڵتاننشینی عومان تا ساڵی ١٩٧٠ تەنیا یەك نەخۆشخانەی تێدا بوو، ئەویش لەلایەن کۆمەڵێکە ؟؟ بەریتانیەوە بەڕێوەدەبرا، دانیشتوانەکەیشی بەکەمترین نەخۆشی بێ چارەسەر دەمانەوە، قوتابخانەو خوێندنگەشی تێدا نەبووەو ڕێژەی خوێندەواریشی تیادا کەمترلە ٢٪ بوو.

## زۆرترین ڕێژەی پزیشك

لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادایە ژمارەیان ١٣١١٠٠ پزیشکە کەلە تۆمارگەی کانی کۆمەڵەی پزیشکانی دداندا تۆمارکراوە.

## گەورەترین ژمارەی پزیشکانی دەروونزانی

هەروەها لە ئەمەریکادایە ژمارەیان ٢٢٠٠٠ پزیشکی دەروونیە ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەی زانایانی دەرونزانی ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٧٨ چل وپێنج هەزار زانا بووە.

## بەشی شانزەهەم

# سەیرو سەمەرەکانی هونەر

### گەورەترین تابلۆ رۆنی

لەجیهاندا تابلۆی (پانۆرامای میسیسپی) یە کە هونەرمەند (لجون باننارد) (١٨١٥ – ١٨٩١)ی کێشاوەیەتی تیایدا ١٩٣٠کم روباری وێنە کێشاوە لەسەر پارچە قوماشێکی ئامادەکراو بۆ وێنەکردن بەدرێژی ١٥٢٤ مەترو پانی ٢,٧م روبەرەکەشی ٥٢٦١م چوارگۆشەیە، لە وە دەچێت ئەو تابلۆیە لە کۆگایەکی دانە وێڵەدا لونگ ئایلنددا لە نیویۆرك سوتابێت لە ١٦ ئایاری ١٨٩١دا پێش مردنی هونەرمەند بەماوەیەکی کەم.

بەڵام گەورەترین تابلۆی رۆنی تا ئێستا مابێت پانۆرامایی (شەڕی کیشبورگ)ە هونەرمەندی فەرەنسی (پول فیلبوتر) لەگەڵ شانزە هاوکاریدا لەساڵی ١٨٨٣ وێنەی کێشا ماوەی وێنە کێشانەکەشی دوساڵ و نیوی خایاند، درێژییەکەی ١٢٤,٩٦م بەرزییەکەشی ٢,١٣٣م و قورسییەکەشی ٦٧٢,٥٣٤٦ کیلۆ گرامە.

## بچوکترین تابلۆی زەیتی

بچوکترین تابلۆی زەیتی لە جیهاندا تابلۆی (وڵاتە بچوکەکەم هۆڵەندا)یە کە هونەرمەند (گیرت تویگت) لە کانونی دووەمی ١٩٧٩ دا وێنەی کێشا، بازنەی تیرەکەی ٠,١٥ سم.

## گرانترین تابلۆی زەیتی

تابلۆی (چوکەندا – مۆنالیزایە) کە هونەرمەندی بەناوبانگ (لیوناردو داڤنشی) وێنەی کێشاوە، ئێستا لەمۆزەخانەی لۆڤەرە لەپاریس، لە

نێوان ساڵانی ١٥٠٣ – ١٥٠٧ وێنەی کێشراوە، چێوەکەشی ٧٧,٤٠٧ × ٥٣,٠٨سم٢.

وێنـــەی خـــاتوو (مادونـــالیزا نمیرئـــادنی)یـــە مێردەکـــەی پـــارەی دروستکردنی نەدایە داڤنشی چونکە وێنەکەی بەدڵ نەبوو، بەڵام شار فەرەنیســـی یەکـــەم پادشـــای فەرەنـــسا کـــڕی بـــە ٤٠٠٠ فلـــۆرین کـــە یەکسانە ٣٩٤٧,٩٥ گم ئاڵتون.

## بەرزترین نرخ لەزیادکردنی ئاشکرادا

لە ٢٧ تشرینی دووەمی ١٩٧٠دا پێشانگای (توحف) وڵدنشتاین لە نیویۆرك تابلۆیەکی وێنەکێش (دیيفۆ فیلاسکیزی) کڕیّ بە٥٥٤٤٠٠٠ دۆلار وێنەکەشـی بـریتی بـوو لەوێنەی (خلاسـی) خزمـەتکاری کـە لـە ساڵی ١٦٤٩ لە رۆما کێشابووی.

## بەرزترین نرخ بۆ وێنەیەکی رۆنی

بەرزترین نـرخ درابێـتە وێنەیـەکی رۆنـی لـەم سـەردەمەدا ٢٠٠٠٠٠٠ دۆلار بوو کە پێشانگای نەتەوایەتی ئوستورالی لە(کانێرا) دای بەوێنـەی (پایەشـینەکان) کـە هونەرمەنـدی ئـەمریکی (جاکسون بولـوك/ ١٩١٢ – ١٩٥٦) کێشابووی ئەویش لە ٢١ی ئەیلولی ١٩٧٣ دا بوو.

## هونەرمەندێك زۆرترین بەرهەمی هەبێت

بیکاسـۆیە لەژیانـدا کـە ٧٨ سـاڵ بـوو، ١٣٥٠٠ تـابلۆی زەیتی‌و ١٠٠,٠٠٠ هەزار چاپکراوو ٣٤٠٠٠ وێنەی سەرکتێب و ٣٠٠ پەیکـەری هەبووە، لە تەمەنی خۆیدا بەرهەمەکانی بایی یەك بلیۆن دۆلار بووە.

## زۆرترین وێنەی

(ئنتۆنیـۆ بێنـی) فەرەنـسییە کـە لـە ٣٠٠ بۆنـەدا وێنـەی مۆنـالیزای کێشاوە، یەکێك لەو وێنانەی بە ١٧٠٠ دۆلار فرۆشرا.

## کۆنترین مۆزەخانە

کـۆنترین مۆزەخانـە لەجیهانـدا مۆزەخانـەی شـاری ئەسـکەندەرییە کـە بتلیمۆسـی یەکـەم لەسـاڵی ٢٨٠ پـێش زایـن دایمەزرانـد، پەیکـەرەکانی خواوەنـدەکانی جوانی‌و مۆسـیقاو شـیعری تێـدابوو هـەروەها نمونـەی تـازەترین داهێنـانو ئامێرەکـانی پیـشەسازی‌و نەشـتەرگەری تێـدا دادەنرا، پاشان کرا بەقوتابخانە یان زانکۆیەك لەیۆناندا.

## گەورەترین کۆشك

کۆشکی (ئاسکۆریاڵ) کە دەکەوێتە سەر چیای (سیبیریاو جاوەمارا) لـەباکوری رۆژئـاوای مەدریـد پایتـەختی ئیـسپانیا، بریتییـە لـە ٢٠٠٠ ژورو ٣٠٠٠ دەرگـاو ٦٠٠٠ پەنجـەرە، لەسـاڵی ١٥٦٣ شـا فیلیـپ-ی دووەم دروستیکردوە، پاشان بوو بە گۆڕستانی پادشایانی ئیسپانیا.

## سەد ملیۆن وشە

نوسەری ئینگلیزی (شارلز هاملتۆن)ە کە بە(فرانك ریچارد) ناسراوە، سالّی ١٩٠٨دا گەیشتە چلّە پۆپەو دوو زنجیرە چیرۆکی بۆ منداڵان نوسیو لەگەڵ وێنەدا بڵاویدەکردنەوە بەناونیشانی زنجیرەی (جیم)و زنجیرەی (ماگنێت) ژمارەی ئەو وشانەی لەژیانیدا بڵاویکردۆتەوە گەیشتە سەد ملیۆن وشە.

## زۆرترین بەرهەمی رۆمان

کچە نوسەرە ئەفەریقای باشور خاتوو (فولکنن)ە کە بە(کاتلین لیندن) ناوبانگی دەرکردوە، ژمارەی رۆمانەکانی ٩٠٤ رۆمان بوو لەژێر چەندین ناوی خوازراودا بڵاویکردونەتەوە، بەڵام زۆرترین بەرهەمهێنەری زیندوو (لوران بین) ە، کە خەڵکی کالیفۆرنیایەو نزیکەی ٨٦٠ بەرهەمی لەژێر ٧٠ ناوی ئەدەبیو هونەری خوازراودا بڵاوکردۆتەوە.

## بەتەمەنترین نوسەر

خاتوو (ئەلیس بۆلۆك) (١٨٦٨ – ١٩٧١) بوو خەڵکی هازلمیزی بەریتانیایە، تەمەنی سەدو چوار ساڵ بوو کاتێك دواین کتێبی خۆی بڵاوکردەوە لەژێر ناونیشانی (وێنەی گەنجیم لەسەردەمی فیکتۆردا) لە ئازاری ساڵی ١٩٧١دا.

# گەورەترین کتێبخانە

کتێبخانــەی کۆنگرێــسی ئەمریکییــە لەواشــنتۆنی پایتــەخت کــە ٧٤٣٨٧٠٠٠ بابــەت لــەخۆدەگرێت لــە ١٨٦٣٨٦٣٣ کتێــب دا، ئــەم کتێبخانەیـە لـە٢٤ نیسانی ١٨٠٠ لەسـەرگردی کـابیتۆڵ دروسـتکراوە، لەسـەر پانتـایی زەویـەکی ١٤١٦٩٣,٧٥م چوارگۆشـە درێـژی ڕەفـەکانی کتێبخانەکە ٨٠کم زیاترە.

## زۆرترین ژمارەی ژور

لەسەرانسەری جیهاندا ئوتێلی (راسیا)یە لە مۆسکۆی پایتەختی روسیا، بریتیەلە دوانزە نهۆم بەهەموویەوە ٣٢٠٠ ژورەو دەتوانێت لەیەککاتدا پێشوازی لە ٦٠٠٠ میوان بکات، ئەم ئوتێلە لە سالی ١٩٦٧دا کراوەتەوە. لە ئامارێکدا هاتووە ئەگەر کەسێك بیەوێت هەر شەوێك و لە یەکێك لە ژوورەکانی ئەم ئوتێلەدا بخەوێت پێویستی بەهەشت سالْ و نیو کات هەیە، سەرەڕای ئەوەش لە حەوشەی ئوتێلەکەدا بینایەکی تر هەیە پێی دەڵێن (قوللەی سەرۆکایەتی) کە لە بیست و یەك نهۆم پێکدێت.

لەم ئوتێلەدا سێ هەزار کارمەندو کرێکار ئیشدەکەن ٩٣ بڵندەك (مصعد)ی کارەبایی هەیە هۆڵی پێشوازی ئەم ئوتێلە گەورەترین هۆڵی پێشوازیە لە دونیادا، ئەوەی شایانی وتنە روسیەکان خۆیان بۆیان نیە لەم ئوتێلەدا بنون و تەنیا بۆ پێشوازی بیانیەکانکراوە هەربیانیەکیش دەبێت شەش بەرامبەر پیاوانی رەسمی سۆڤێت پارە بدات بۆ مانەوە لەم ئوتێلەدا.

## گەورەترین ئوتێل (کەرتی تایبەت)

گەورەترین ئوتێل کە مۆڵکی خەڵك بێتو هی دەوڵەت نەبێت ئوتێلی (والدورف ئاستوریا)یە لەنیویۆرك، دەڕوانێتە سەر پارکی ئاڤینۆداو ئەو

زەوییەی ئەم ئۆتێلەی لەسەر دروستکراوە سێ چارەکە هیکتارە، بەڵام بەرزییەکەی لەنزیکی ۱۹۱ مەترەدایە، ئوتێلەکە بریتییە لە ٤٧ نهۆم و ۱۸۵۲ ژورو گەورەترین سیستەمی وەرگری بێتەلی تێدایە لەهەموو جیهاندا، دەتوانێت لەیەککاتدا پێشوازی لە ۱۰ هەزار کەس بکات و ۱۷۰۰ کارمەندو کرێکار ئیشی تیادەکەن.

بەڵام چێشتخانەکانی دەتوانن لەیەککاتدا خزمەتی شەش هەزار میوان بکەن، ئەوەش زانراوە چایخانەی ئوتێلەکە رۆژانە ۳۷۸۵ لیتر قاوە پێشکەش بەمیوانەکانی دەکات.. نرخی ئەو کارەبا خەرج بووەی لەلایەن ئوتێلەکەوە دەدرێتە کۆمپانیای کارەبا ساڵانە دەگاتە دوو ملیۆن دۆلار ئەم ئوتێلە لەرۆژی یەکەمی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۳۱ دا بۆ یەکەمینجار کراوەتەوە.

## گەورەترین ئوتێل لەفەرەنسا

گەورەترین ئوتێلی فەرەنسا ئوتێلی لافاییت کۆنکۆردە لەپاریس نیۆرت مایۆ، کە لەساڵی ۱۹۷٤ دا دروستکراوە.

ئەم ئوتێلە هەزار ژورو ۲۱ شوقەو ٤ بەشی سەرۆکایەتی لەخۆدەگرێت، روبەری گشتی ئوتێلەکە ۵۰,۰۰۰م۲، کە دە بڵندەکی تیدایە لەگەڵ بڵندەکی تایبەتی سەرخستنی شتومەك، لەگەڵ قوللەیەکدا کە بەرزییەکەی ۱٦۹م.

## بەرزترین ئوتێل

بەرزترین ئوتێلی جیهان ئوتێلی (بلازا) یە لەشاری ئەتڵەنتا لەویلایەتی جۆرجیای ئەمەریكا، بەرزییەكەی ٢٢٠,٣٠م كە بەسەر ٧٠نهۆم دا دابەشبووە، بریتیە لە ١١١٠ ژوور بە بڕی ٥ ملیۆن دۆلار دروستكراوە ئەم ئوتێلە لەلایەن تۆڕی رستورن ئەنتەر ناسیونالەوە بەڕێوەدەبرێت كە هی دەزگای بورتمان بروبرتیزە. بەلام ئوتێلی دیترویت بلازا بەرزییەكەی ٢٢٧م، لەم كاتەشدا لەسەنگافورە ئوتێلێك دروستدەكرێت بەناوی (رافلزسیتی) بەرزییەكەی دەگاتە ٢٣٠ مەترو بریتییە لە ٧١ نهۆم، بڕی ٢٠٠ ملیۆن دۆلاری تێدەچێت.

## گەورەترین هۆڵی ئوتێل

هۆڵی دانیشتنی ئوتێل (تالێ)یە لەتایواندا لەگەورەترین هۆڵ دادەنرێت لەجیهاندا لە ١٠ تشرینی یەكەمی ١٩٧٣دا دروستكراوە درێژییەكەی ٤٧م پانیەكەشی نۆ مەترو شەست سانتیمەترە.

## گرانترین ئوتێل

گرانترین ئوتێل لەدونیادا ئوتێلی (ئاسترۆ فیلادج)ە لە شاری هوستۆنی ویلایەتی تەكساسی ئەمەریكا، كرێی نوستنی شەوێكی

جیهان

لەگرانترین شوقەیدا کە پێی دەڵێن (سویت سیلیست) دەگاتە سێ هەزار دۆلار.

## درێژترین مەلەوانگە

مەلەوانگەی (فەرجینیاتیش)ە لەویلایەتی ڤێرجینیای ئەمەریکا درێژیەکەی ٤٥ کم لەلێواری زەریای ئەتڵەسی سەرەڕای ١٦کم وشکانی روبەری گشتی مەلەوانگەی ٦٦٠ کیلۆ مەتر دووجایە. بەدرێژایی مەلەوانگەکەی ١٣٤ ئوتێل دروستکراوە.

## گەورەترین شاری کانی دار

شاری (فیشی) فەرەنسایە، کە ١٢ سەرچاوەی ئاوی لێدەهەڵدەقوڵێت و بۆ نەخۆشییەکانی رۆماتیزم و کۆئەندامی هەرس بەکاردەهێنرێت، ئاوەکەی مادەی سۆدای بیکاربۆناتی تیدایە، ئەو ١٢ سەرچاوەیە شەشیان بۆ چارەسەر بەکاردێت و سیانیان ئاوەکەی گەرمەو،سیانیشیان ئاوەکەی ساردە، رۆژانە ٨٦٠ هەزار لیتر ئاو لێیانەوە هەڵدەقوڵێت.. بەهەمیشەیی لەو شاردا ٢٥ هەزار کەس دەژین و لەکاتی چارەسەردا ئەو شارە دەتوانێت جێی ١٠ هەزار کەسی تر بکاتەوە. چونکە ٣٠٠ ئوتێلی تێدایە کە ٨٠٤٠ ژور لەخۆیان دەگرن جگە لەشوقەی ئامادەکراو.

## بەرزترین شاری سەرچاوە دار

شـــاری (بـــاریج)ی فەرەنـــسایە کـــە دەکەوێتـــە بـــەرزی ١٢٤٠م وە لەسەرشاخی (بیرینەی سەرو)

## گەورەترینیانە بۆ ئارەزومەندانی سروشت

یانەی (بۆقالی کاوبتری)یە لەشاری (وائمیاتـ) لەکۆماری ئەفریقای ناوەند، لەسەر روبەرێکی چوار کیلۆمەتری دوجایەو بیست هەزار میوان لەخۆدەگرێت لەساڵێکدا.

## گەورە ترین چادرگەی فەرەنسا

چـادرگەی (فیوبـودغ) لـەلێوارە باکوریەکانـدا لەسـەر روبـەری ٥٢ هێڵکاری زەوی.

## بەرزترین چێشتخانەی خولاوە

دەکەوێتە بەرزیەکەی ٣٤٧,٥٠ م، لەناو قوللەیەکی تایبەت بەهەوایی رادیـۆ فارسـوفیا نزیـك بلـۆك لـەپۆلۆنیا، ئـەو قوللەیـە بەبـەرزترین بینـا لەجیهاندا دادەنرێت. هەروەها چێشتخانەیەکی تر هەیە لەسەر بەرزایی ٣٤٧ م وە دروسـتکراوە لەسـەر بینـای هـەوایی تەلـەفزیۆنی سـی ئـێن تاوەر لەتۆرینتۆی کەنەدا.

## کۆنترین کابارەی شەوانە

کابارەی (بل دی زانغلی)یە کە دەکەوێتە ژمارە شەش جادەی ئینگلیز لەبازنەی پێنجەم لەپاریس لە ساڵی ١٨٤٣ دروستکراوەو لە ساڵی ١٩٦٠دا دەرگاکانی داخران.

## گەورەترین کابارەی شەوانە

یەکەمیان (گرنیلاندکلاب)ە کە لەساڵی ١٩٥٥ دروستکراوە، لەساڵی ١٩٧١ فروانکراوەتەوە، دەکەوێتە سەرجادەیەکی گشتی کە ناسراوە بە (سبنسر هایوای) لەشاری هوستون لەویلایەتی تەکساسی ئەمەریکا، ٣٠٠٠ کەس دەتوانێت تیایدا دانیشێتو دەتوانێت ٥٠٠٠ کەس میوانداری بکات لەشەوێکدا.

هەروەها دووەمیان یانەی (میکادۆ)یە لەجادەی ئەکاساکا لەشاری تۆکیۆی ژاپۆن کە ٢٠٠٠ کەس لەخۆدەگرێت، لەلایەن ١٢٥٠ خزمەتکارەوە پێشوازی دەکرێت، لەم جێگایەدا مرۆڤ پێویستی بەدووربینێکی تایبەتی هەیە تا ئاهەنگەکان بەباشی ببینێت.

## بینای بازرگانی

گەورەترین روبەری زەوی کە بینای لەسەر کرابێت (سەنتەری فۆردە بۆ دابەشکردنەوەی گۆڕینی پارچە یەدەکییەکان) لەناوەڕاستی شاری مشیگان، روبەری زەوی ناو بیناکە ٢٨٧٩٩٩,٣٠م٢، لەساڵی ٢٠ ئایاری ١٩٧١ کراوەتەوەو ١٤٠٠ کارمەند ئیشی تێدا دەکات.

## گەورەترین بینای بازرگانی

کارگەی کۆکردنەوەی سەرەکی کۆمپانیای (بۆینگ)ە لە ئیفیریتی واشنتۆن لە ساڵی ١٩٦٨دا بیناکراوە، تایبەتە بە دروستکردنی فرۆکەی (بۆینگ ٠,٧٤٧) کە دور ترین بەرزی ٣٥,٠٥٢م و، بەبلاویەکەشی ٦٦٣٢٤٠م٣

## گەورەترین بینای زانستی

گەورەترین بینای زانستی (بینای کۆکردنەوەی کەشتیەکان)ە کە تێدا دواین کۆکردنەوە دەکرێت بۆ ناردنی کەشتی ئاسمانی ئەپۆلۆ بۆ سەرمانگ لەسەر موشەکی ساترن لەسەنتەری لەندەن بۆ ئاسمانی ناسی.

## گەورەترین بینای بەڕێوەبردن

بینای وەزارەتی بەرگری ئەمریکی (پنتاگۆن)ە لە ئارلنجۆی ڤەرجینیا لـە ١٥ کـانونی دووەمـی ١٩٤٣ دروسـتکراوەو بـڕی ٨٣ ملیـۆن دۆلاری تێـچووە، درێـژی هەرلایـەك لـەلاکانی ٢٨٠,٧٢٠م و چـێوی بیناکـەش ١٣٧١,٦٠م روبەری هەر پێنج نهۆمەکەیشی ١٩١٨٢٠٢٩م چوارگۆشەیە لـەرۆژدا ٢٩ هـەزار کارمەنـد ئیشی تێـدادەکات، زیـاتر لـە ٤٤٠٠٠ هێڵـی تەلەفۆنی تێدایە وشەی (پەنتاگۆنیش واتا پێنج گۆشە دەدات).

## گەورەترین بینای نوسینگە

بینای (ئەلبرجانی دوانەیە) جوتە بینایەکن لەتەنیشت یەکەوە، پێـی دەوترێـت بارەگـای بازرگـانی جیهـانی لـەنیویۆرك، روبـەری گـشتی ٤٠٥٩٣٧م دوجایـە، بەرزییەکەشـی ٤١١,٤٨ م بـوو لـە٢٠٠١/٩/١١ وە تەقێنراوە.

## بەرزترین بینای نوسینگە

قوللەی (سیرز)ە کە سەنتەری سەرەکی کۆمپانیای (سیرز رۆیاك)ە لـە شیگاغۆ بریتییە لە ١١٠کیلۆ گرامو بەرزیەکەشـی ٤٤٣,١٧٩م، لەسـاڵی ١٩٧٤ بینـاکراوە، رووبـەری گـشتی ٤٠٨٧٦٠م٢، کاتێـك هەواییـە تەلەفزیۆنییـەکانیان لەسـەری دانـا بەرزییەکـەی گەیـشتە ٤٧٥,١٨٣م،

ژمارەی ئەو کرێکارانەی کە لەدروستکردنی ئەم بینایەدا بەشداریان کردووە ١٦٧٠٠ کرێکار بوون، ١٠٣ بڵندگۆ ١٨ پەیژەی جوڵاو ١٦٠٠٠ پەنجەرەی تێدایە.

## گەوەترین باڵیۆزخانە

باڵیۆزخانەی روسیایە لەپەکینی پایتەختی (چین) روبەری گشتی باڵیۆزخانەکە ١٨١٠٨,٤٢٠ م٢

## گەورەترین ماڵی تایبەت

ماڵی (بێلتمۆر)ە لەکارۆلینای باکور، کە ٢٥٠ خانوی تێدایەو موڵکی جۆرج ولیام سیسیلی نەوەی جۆرج واشنتۆنە لەنێوان ساڵانی (١٨٩٠ – ١٨٩٥) دا دروستکراوە بە بڕی ٤١٠٠٠٠ دۆلار بەڵام نرخی ئەمڕۆی دەگاتە ٥٥٠٠٠٠٠٠ ملیۆن دۆلار رووبەرەکەشی ٤٨٥٦٢٢٠٠م ٢.

## گرانترین ماڵی تایبەت

ماڵی (هیرست رانش)ە لەسان سیمۆنی کالیفۆرنیا لەنێوان ساڵانی ١٩٢٩ – ١٩٣٩ بیناکراوە بڕی ئەو پارەیەی تێچووە زیاتر لە٣٠٠٠٠٠٠ دۆلار بووە زیاد لە ١٠٠ ژووری تێدایە لەگەڵ مەلەوانگەیەکدا کە خۆی ئاوەکە گەرم دەکات درێژییەکەی ٣١,٦٩٩م و لەگەڵ هۆڵێکی

کۆبوونــەوەدا کــە درێژییەکــەی ٢٥,٢٩٨م لەگــەڵ گەراجێکــدا کــە ٢٥ ئۆتۆمبیل دەگرێت.

## گەورەترین یاریگای پلەدار

یاریگــای (ســۆپردوم)ە لــەنیوئورلیا نزیلــو بزیانــا، رووبەرەکــەی ٥٢٦,٩,٩٥ مەتر چوارگۆشەیەو درێژییەکەشی ٨٨٣,٢٠٠٠ م بڕی ١٧٣ ملیــۆن دۆلاریــشی تێــژووە لــەئایاری ســاڵی ١٩٧٥ دا دروســتکراوە، ٩٧٣٦٥ کــەس دەگرێــت لــەکاتی کۆبوونــەوەداو ٧٦٧٩١ کەســیش دەگرێت ئەگەر هەریەك لە سەر کورسیەك دانیشێت.

## گەورەترین شوێنی سەرگەرمی

(دزنــی وورلــد)ە بــۆ ســەرگەرمی ١١١,٠٥٧٥کیلــۆ مــەتر دووجا لەهــەر دوو هــەرێمی ئــورانج و ئەســکیلولای باشــوری رۆژئــاوای ئورلانــدۆی فلۆریدایــە، لەتــشرینی یەکــەمی ١٩٧١ دا کرایــەوەو بــڕی ٤٠٠ ملیــۆن دۆلاری تێچووە، لەساڵی یەکەمدا ١٠٧٠٠٠٠٠ کەس سەردانیان کرد.

## بەرزترین قوللە

قوللــەی (ئیڤــڵ)ە لــە پاریــسی فەرەنــسا کــە ئەنــدازیار غۆســتاڤ ئیڤــڵ (١٨٣٢ – ١٩٢٣) نەخشەی کێشا وەکو هێمایەك بۆ پێشانگای پاریس،

لە ٣١ ئازاری ١٨٨٩ دا کارکردنی تیایدا تەواو بوو، بەرزییەکەی ئەو کاتە ٣٠٠,٥٢٥ مەتر بوو، ئەمجا بەهەواییەکی تەلەفزیۆن بەرزکرایەوە تا گەیشتە ٣٢٠,٦٥٩ م قورساییەکەی ٧٣٤٠٠,٧ کیلۆ گرام و ١٧٩٢ پلێکانەی تیدایە، لەکاتی هەڵکردنی رەشەبادا دەجوڵێتەوەو، بڕی تەواوکردنی بینای ئەو بورجە ٧٧٩٩٤٠١ فرەنك و ٣١ سەنت بووە.

## کۆنترین پرد

کۆنترین پرد لەجیهاندا کە تا ئێستا مابێتەوە مێژوی دەگەرێتەوە بۆ ساڵی ٨٥٠ پێش زاین، ئەویش پردێکە لەسەر روباری میلیز لەشاری ئەزمیری تورکیا

## درێژترین پرد

درێژترین پرد لەجیهاندا پردی (هامبر ئەستوری)یە لەبەریتانیا، بری ١٣٥ ملیۆن دۆلاری تێچووە، درێژییەکەی ١,٤١کمو ماوەی ئیشکردن تیایدا لە ٢٧ تەموزی ١٩٧١ تا حوزەیرانی ١٩٨٠ بووە، بەرزی هەردوو قوللەکەی ١٦٢,٤٦١م.

## درێژترین پردی هەڵواسراو

پردی (ماکیناکە) لەنێوان هەردوو شاری ماکینامو سانت ئیفناس لەشاری میشیگن درێژی نێوان دوو خاڵی چەقیوی ٢,٥٤٢کم، ئەگەر بەگشتی درێژییەکەی بپێوین دەگاتە ٥,٨٤٠٦ کم، لەتشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٥ دا کرایەوەو، بڕی سەد ملیۆن دۆلاری تێچووە، درێژییەکەی بوەوەیەکی سەرەکی هەیە دەگاتە ١١٥٨ کم.

## درێژترین پرد لەدوو خاڵی چەقیودا

پردی (کوبك) لەسەر روباری لورنس لەکەنەدا، درێژیەکەی لەنێوان دوخاڵی چەقیودا ٥٤٨,٦٤ م، درێژی گشتی ٩٨٧,٢٤٧م، هێڵێکی ئاسنی لەسەرە لەگەڵ دوو رێگەی ئۆتۆمبیلدا، لەساڵی ١٨٩٩ دەست کراوە بەئیشکردن تیایداو لەسێی کانونی یەکەمی ١٩١٧دا کرایەوە، ئەو کاتە نزیکەی ٢٢٥٠٠٠٠٠ دۆلاری تێچووە لەەی ئیشکردن تیایدا ٨٧٠٠ کەس گیانیان لەدەستداوە.

## درێژترین پردی سروشتی

درێژترین پردی سروشتي لەجیهاندا (تاقی دیمەنی سروشتیە) لەباخچەی تاقە سروشتیەکانی باکوری ئۆتاوا. درێژی ئەم پردە ٨٨٠٦٩م.

## گەورەترین پرد

پردی (پەلکە زێرینە)یە لەئۆتاوا کە لە ١٤ی ئابی ١٩١٩دا دۆزرایەوە درێژییەکەی ٨٤٠٧٣٤م و پانیەکەشی ٦,٧٠٥م.

## درێژترین کەنداو

درێژترین کەنداو، کەنداوی سوێسە کە دەریای سپی ناوەراست بەدەریای سورەوە دەبەستێتەوە لەلایەن ئەندازیارو دیپلۆماتی فەرنسی (فریناند دیلیبس)ەوە (١٨٠٥ – ١٨٩٤) نەخشەی کێشراوە، درێژییەکەی ١٦١,٨٦٥ کم لە پۆرسەعیدەوە بۆ کەنداوی سویس، پانیەکەشی ٦٠,٠٤٥م، تیایدا ٨٢١٣ پیاوو ٣٦٨ حوشتر ئیشیکردوە، لە ١٦ تشرینی دوەمی ساڵی ١٨٦٩ دا تەواو بووە.

## قەڵەباڵغترین کەنداو

کەنداوی پانامایە کە لە ١٥ی ئابی ١٩١٤ تیایدا هاتوچۆکراوە، لەساڵی ١٩٧٤ دا ژمارەی کەشتییە تێپەرییوەکان پیایدا گەیشتوەتە ١٤٣٠٤ کەشتی. گرنگترینیان کەشتی شابانو (ئەلیزابیس)ی دووەم بوو، کە لە ٢٥ ئازاری ١٩٧٥دا پێیدا تێپەڕی.

## گەورەترین تونێل

تونێلی (دلاوین)ە كە ئاو دەداتە بەشی رۆژئاوای شاری نیویۆرك، لە ساڵی ١٩٣٧ دەستكرا بەئیشكردن تیایداو لەساڵی ١٩٤٤دا تەواوكرا، تیرەكەی ٤,١١٤٨م و درێژییەكەشی ١٦٨,٩٤٥كم، لەتانكیەكانی رونـدوتی چیای كاتسكیانەوە ئاو دەگوێزێتەوە بۆ تانكیەكانی هیلفیۆی سنوری شاری نیویۆرك.

## درێژترین تونێل بۆ شەمەندەفەری كارەبایی لەژێر زەویدا

تونێلی هێڵی ئاسنی سەر بەبەڕێوەبەرایەتی گواستنەوەیە لەلەندەن درێژییەكەی ٤٨٢,٨٠٣م، كە (وردن) و رۆژهەڵاتی (فیشلی) لەرێگەی بانك لەلەندەن پێكەوە دەبەستێتەوە ئەم تونێلە لەساڵی ١٩٣٩ وە بەكاردەهێنرێت.

## درێژترین تونێلی ئۆتۆمبێل

تونێلێكە لەسان ئەنتوانی رۆژئاوای نەمساوە دەست پێدەكات، درێژییەكەی ١٣,٩٩٨كم، لە ٩ كانونی یەكەمی ١٩٧٨ كراوەتەوە.

بەڵام تونێلێك كە گەورەترین تیرەی هەبێت لەجیهاندا پانیەكەی ١٣,١٦٤م و بەرزییەكەشی ١٧,٦٧٨م و درێژییەكەشی ١٦٤,٥٩٢م و دەكەوێتە دورگەی بریایۆنای كەنداوی سانفرانیسكۆوەو ساڵانە ٢٥٠٠٠٠٠٠ ملیۆن ئۆتۆمبیل تیایدا هاتوچۆ دەكات.

## کۆنترین بەنداو

بەنداوی (الکفرە)یە لە میسر کە دەکەوێتە ١١,٢٦٥کم ی باشوری شاری حەلەوانەوە لە نێوان سالآنی ٢٧٥٠,٢٩٥٠ پێش زاین دروستکراوە، درێژییەکەی ١٠٦,٠٧م و بەرزییەکەشی ١١,٤٧م.

## مەزنترین بەنداو

مەزنترین بەنداو لە قەبارەدا بەنداوی (کورنیلیا تیلینج)ی تازەیە، بەنداوێکی لەگەڵ دروستکراوە لە نزیك شاری ئاجۆی ویلایەتی ئاریزۆنای ئەمەریکا، بەرزییەکەی ٢٩,٨٧م و درێژییەکەشی ١٠,٨٤٦کم و قەبارەکەشی ٢٠٩,٢٥٥,٨٤٦ م٣ یە.

## گەورەترین بەنداوی چیمەنتۆ

بەنداوی (کولە مەزنە) لەسەررووباری کۆلۆمبیا، لە ساڵی ١٩٣٣ دەستکرا بەکارکردن تیایداو لە ٢٢ ئازاری ١٠٤١ بەکارهێنراوە لە ١٩٤٢دا بە تەواوی تەواوکرا، بڕی ٥٦,٠٠٠,٠٠٠ دۆلاری تێچوە، درێژییەکەی ١٢٧١,٩٣ م و بەرزییەکەشی ١٦٧٠٦٤ م و ٨٠٨٦٩٤٠م٣ چیمەنتۆی تیادا بەکارهێنراوە. کارگەیەکی تیایە بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا.

## بەرزترین بەنداو

بەنـــداوی (دیکنـــسی مەزنـــە) لـــە سویـــسرا لـــە ئـــەیلولی ١٩٦١ دا دروستکراوە، بڕی ٣٧٢ ملیۆن دۆلاری تێچووە، ئاستی بەرزییەکەی بۆ لوتکەی بەنداوەکە ٢٨٤,٩٨ م، بەرزەو درێژییەکەشی ٧٠٠م.

## درێژترین بەنداو

درێژترین بەنداو لەسەر روباری (کیێڤ)ە کە بەرزییەکەی ١٨,٨٩م و لەســەر روبــاری (دنــیبر)ە لــە روســیا لــە ســاڵی ١٩٦١ دروســتکراوە، درێژییەکەی ٥٤,٧٢کم.

## بەهێزترین بەنداو

بەنداوی (سیاتۆشوزنیکایا)یە لەسەر روباری (سیانوشوزنیکابا) لە روسیا بەشێوەیەك دروستکراوە کـە ٢٠١٦٠٠٠٠ تـەن ئاو پاشـەکەوت دەکات.

## گەورەترین کەشتی نەفەرهەڵگر

کەشتی پاشایەتی (شازادە ئەلیزابیسە) لەزێبالٚ (ئستولٚ)ی کۆنارد بارەکەی ٨٢٩٩٨ تەن-ەو درێژییەکەی ٢١٤,٢٤٨م پانییەکەشی ٣٥,٩٨٣مەترە، بەڵام ئەم کەشتییە مەزنە لە ٦٩ کانونی دووەمی ١٩٧٣دا لە سێ شوێنەوە ئاگری تێبەربوو، لەئاکامدا سووتا.

## گەورەترین فرۆکە هەڵگر

هەردوو فرۆکە هەڵگری (نیمیتز)و (وایت ئایزنهاوەر)ە کە سەر بەهێزی دەریایی ئەمەریکان کێشی هەریەکەیان ٩١٤٠٠ تەنەو خێراییەکەی ٥٥,٥٩٠ کم و لەسەعاتێکدا، ئایزنهاوەر یەکەم گەشتی لە ١٨ تشرینی یەکەمی ١٩٧٧ دا دەستیپێکردو، زیاتر لەیەك بلیۆن دۆلاری تێچووە.

## گەورەترین بزوێنەری کەشتی

کەشتی نەوت گوێزەرەوەی (الروضتین)ی کوەیتییە کە لەساڵی ١٩٧٦دا لە شانتییر نافال دی لاسیوتای فەرنسا دروستکراوە، قورسییەکەی ٨٢,١٣ تەنەو تیرەکەی ٩,٤٤٨ م.

## خێراترین ژێر دەریایی

ژێـر دەریـایی نـەوەوی سـەربازیبالّ (نـستولّ)ی ولایەتـە یەکگرتووەکانـە لەکۆمەڵەی (لوس ئەنجلوس) دەتوانێـت لەسەعاتێکدا ٥٥,٥٩٠ کم ببڕێت بەلاّم زۆر لەوە خێراتر دێتە بەرچاو.

## گەورەترین ژێر ئاوی

ژێـر ئـاوی گەردیلـەیی (نۆهـایۆ)یـە کـە دروسـتکرنەکەی بـڕی ١٢٥٠٠٠٠٠٠ دۆلاری تێـچووە، لەنیـسانی ١٩٧٩ گەرێنرایـەوە بـۆ خزمـەتکردن لـەگروتۆن – بکو نیکتیکوندا، ٢٤ موشـەکی (تلایـدنت ١) هەڵـدەگرێت کـە هـەر موشـەکێك ماوەی ٧٤٠١,٤ کم دەبڕێت.

## درێژترین ئۆتۆمبیل

یەکـەم ئۆتـۆمبیلی سـەرکەوتوو کـە بەبـەنزین ئـیش بکـات ئۆتـۆمبیلی (موتـورواغن) بـوو کـە کـارل فریـدرك بـەنز (١٨٤٤ – ١٩٢٩) لەسـالّی ١٨٨٥ دروستیکردو لە شاری مانهایم‌ی ئەڵمانیادا رێیکرد، خێراییەکەی لـە١٢,٨٧کـم گەیـشتە ١٦,٠٩٤ کـم لـە سـەعاتێکدا لـە ٢٩ کـانونی دووەمـی ١٨٨٦دا لــە دەستاوێردی داهێناندا تۆمارکرا.

## پتەوترین ئۆتۆمبیل

درێژترین رێگا کە بڕیویەتی ١,٩٠٦,٤٧ کم بوو کە ئۆتۆمبیلی مارسیدسی (R.D) بڕیی لەئۆلومبیا کە خاوەنکەی روبەرت ئۆرئیلی بوو.

## خێراترین ئۆتۆمبیل

خێراترین ئۆتۆمبیل (١٠١٦) کم دەبڕێت لەکاتژمێرێکدا ناوی ئۆتۆمبیلەکە (گڕی شین)ەو بەگازی شلی سروشتی دەڕوات.

## خێراترین ئۆتۆمبیلی نەفاسە

زۆرترین خێرایی کە ئۆتۆمبیلێکی نەفاسە بڕیبێتی ٨٨٩کم بووە لەسەعاتێکدا ناوی ئۆتۆمبیلەکەش (سبیریت ئۆف ئەمەریکا)یەو درێژییەکەی ١٠م.

## خێراترین ئۆتۆمبیلی پێشبڕکی

ئەم ئۆتۆمبیلە خێراییەکەی گەیشتە ٤١٤کم لەسەعاتێکدا (مارك دونوهر) بەدەستیهێناوە لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەئۆتۆمبیلی پۆرش ٣٠,٩١٧ کە بزوێنەرێکی هەیە بە ١٢ تۆڕبین.

زۆرترین نرخ درابێتە ئۆتۆمبیلێکی بەکارهێنراو ٤٢١٠٤٠ دۆلار بوو درایە ئۆتۆمبیلێکی مارسیدسی بیوز وودسە لەساڵی ١٩٣٦دا لە گروپی (م.ل

کوهین)ە پیاوێکی خەڵکی مۆناکۆ کڕیی بەهۆی پەیوەندییەکی تەلەفۆنییەوە لەگەڵ کونسوڵی (کریستی) لەلۆس ئەنجلۆس لەساڵی ١٩٧٩دا.

## گرانترین ئۆتۆمبیلی تایبەت

ئۆتۆمبیلی سەرۆکایەتی ئەمەریکا (لنکوڵن)ە ساڵی ١٩٦٩ (کۆنیتنیتاڵ ئەکزیکیوتیف) بوو کە تەسلیم بەفەرمانگەی ئیستخباراتی نهێنی ولایەتە یەکگرتووەکان کرا لەساڵی ١٩٦٨دا. درێژییەگەی ٦,٥٦ م بوو بنکەی تایەکانی ٤,٠٦م و فیشەك نەبڕ بووەو کێشەکەشی ٥٤٤٢ کیلۆ گرام بووە، دروستکردنەکەشی ٥٠٠٠٠٠ دۆلاری تێچووە.

## درێژترین ئۆتۆمبیلی گشتی ( پاس )

٢٣,١٦٤م و، ١٢١ کورسی تێدایە، سەرەڕای ئەوەی ٦٦ کەس دەتوانێت تیایدا بەپێوە بوەستێت، کێشی ١٢ تەن ـە.

## بەرهەمهێنانی زۆرترین ئۆتۆمبیل

کۆمپانیای جۆدێت (فلات توین) توانی ٤٢ ساڵ بەردەوام ئۆتۆمبیل بەرهەمبهێنێت لەساڵی ١٩١٠ تا ١٩٥٢، تەنانەت لەرۆژەکانی جەنگی جیهانیشدا لەبەرهەمهێنان نەوەستا.

## فراوانترین فرۆکەی نەفاسەی هێڵی ئاسمانی

فڕۆکـــەی کۆنکـــۆردە (Abc) ئەبروسباشـــیاڵ، ١٢٨ کـــەس دەگرێـــتو لەسەعاتێکدا ٢,٣٣٣ کم دەبڕێت یان ٢,٢ جار لەدەنگ خێراترە، ئەم فڕۆکەیـە لـە ٢١ کـانوونی دووەمـی ١٩٧٦ دەسـتبەکاربوو کاتێـك هـەردوو کۆمپانیـای فڕۆکەوانی فەرەنسیو هێڵی ئاسمانی بـەریتانیا هێڵێکیـان کـردەوە، لـەنێوان پـاریس و ڕۆدیـۆ جـانیرۆی لـە لەندەنـدا، ئـەم فڕۆکەیـە ڕێکـۆردێکی تـازەی تۆمارکرد لەنێوان لەندەنو نیویۆرکدا، ئەویش ٣ سەعاتو ٦ دەقیقە بوو.

## خێراترین فڕۆکەی نەفاسە

بریتییـــە لەفڕۆکـــەی (لـــۆك هیـــدس)ە بـــۆ دۆزینـــەوە (ئیستکـــشاف) خێراییەکـەی گەیـشتە ٣٥٢٨,٨٠ کـم کاتێـك یەکـەمجار فـڕی لـە ٢٢ کـانونی دووەمی ١٩٦٤ دا ٤٧٩٧,٩ کم بەرزبویەوە.

## بەرزترین فڕین

(ئەلکسەندەر فیدوتوف) تۆماری کرد بەفڕۆکەیەکی جۆری میکربـان -A- ٢٢٦م (فیـج ١٢٥) لە ٣١، ئاب، ١٩٧٧ بۆ بەرزی ٤٧٦٤٩,٧م .

بەشی بیست و پێنج

# سەیرو
# سەمەرەی راستییەکان

!.. مێرو لە تەنیا مێرویەکی کۆمەڵایەتیە لەناو مێروەکاندا لە هەموو کاتێکدا کەمتر لە پانزە یان پێکەوە نین.

!.. مۆزەخانـەی هونـەری نـوێ لـە نیویـۆرك تـابلۆ لوبـانو (کەشـتی) وێنەکێشی بـەناوبانگی فەرنـسی هاتـسی سـەرو ژێـر هەلواسی دوای چل و حەوت رۆژ بەو هەڵەیە یان زانی و راستیانکردەوە.

!.. درێـژترین مـاچ لـە مێـژوودا تۆمارکرابێـت هـی ئـەو ژن و پیـاوە بەرازیلیە بوو لە ساڵی ١٩٦٤دا کاتێك لەسەر شەقامێکی گشتی ویستیان خێـرا ماچێکی یـەکتری بکـەن بـەڵام ددانـە ئاڵتونـەیاکانیان لەیـەك گیرکـردو بـووە هۆی قەرەباڵغیکردنی رێگەکە.

!.. هیتلەر هیچ نامەیەکی تایبەتی نەبووە.

!.. هـەموو ورچـە جەمـسەرییەکان (القطبیـة) هـەرگیز لای راسـتیان نـە لەهێرش و نەلە بەرگریدا بەکارناهێنن.

!.. یانەی سێرکی مۆسکۆ تیمێکی مانگای هەیە لەسەر ئیقاعی مۆسیقای روسی سەمادەکەن ویاری تۆپی پێش دەکەن.

!.. زانایـــەکی دەروونناســـی زانکـــۆی بریمنگهـــام یـــونگی ویلایەتـــە یەکگرتووەکان دەڵێت: لـە ١٥٪ ئەمریکییـەکان بـەنهێنی نینـۆکی پەنجـەکانی پێیان دەکەن.

!.. ئافرەتـان لـەپیاوان گوێیـان سـوکترە، ئەمـە لـەراپۆرتێکی زانایـەکی دەروونناسـی بەریتانایـدا هـاتووە، هـەروەها ئافرەتـان توانـای بەرگـەگرتنی

تیشکیان لەپیاو زیاترە، وەك چۆن لەتاریکیدا شتەکان لەپیاو باشتر دەبینین، هەروەها زیاتر لەپیاو هەستیارن بۆ درێژترین شەپۆلەکانی سورو پرتەقاڵی.

!.. ئەرینا گودینی پەرستیار بەوەوە دەنازێت کە خاوەنی درێژترین قژە لەبەریتانیادا کە درێژییەکەی ١٩٢سم، لەکاتی شۆردنیدا بوتڵێك شامپۆ بەکاردەهێنێت لەناو حەوزێکی درێژدا خۆی دەشوات.

!.. لەئوستورالیادا سەگێکی رەش لەجۆری لابرادۆر کەناوی (راستوس) فێری هونەری خلیسکان بووە بەسەر ئاودا.

!.. لەساڵی ١٩٧٢دا لەساری بولیسمەی بەرازیل پیاوێك ویستی بچێتە سینەمایەکەوە بەڵام کاربەدەستان قبوڵیان نەکرد، چونکە پیاوەکە مارێکی پێبوو لەجۆری (بوا).. کاربەدەستان وتیان لەبەر ئەوەی قبوڵمان نەکردوە بچێتە ژورەوە چونکە مارەکە ناکامە.

!.. گیانلەبەران دەتوانن پێشبینی کەشو هەوا بکەن، ئەڵمانییەکان ژمارەیەکی زۆر بۆقیان هەیە گوایە بارومەتری زیندون، لەبەرئەوەی لەکاتی دابەزینی فشاری کەشدا دەیان قیڕاند، مێرولەش لەپێش بارانبارینـدا دەگوێزنەوە بۆ شوێنێکی بەرز، هەروەها خوری بەرخیش چرچولۆچی نامێنێت.

!.. مارە کوهیری خەڵکی ویلایەتی نیوجێرسی ئەمەریکا دوو دۆلاری دایە پیاوەکەی‌و وەسیەتی کرد بەو مەرجە دوای مردنی نیوەی ئەو پارەیە بداتە پەتێک‌و خۆی پێ بخنکێنێت.

!.. یەکەم پێشانگای پەتانە لەجیهاندا پێشانگای پەتاتەیە لەقوتابخانەی نێودەوڵەتی بروکسلی پایتەختی بەلجیکا، پێشانگاکە مۆسیقایەکی پەتاتە لێدەدات کە مۆسیقاری ئەڵمانی (یوهان سیباستیان باخ) داینا‌وە کە ئاگاداری میوانان دەکاتەوە ماری ئینتوانێت کلاوێکی لەگوڵی پەتاتە کردۆتە سەر تا جەماوەری رووەکە زیاد بکات.

!.. لێکۆڵینەوەیەک کە لەسەر تۆمارگاکانی توێکاری مردوان کراوە، دەرکەوتوە کەوا مێشکی لە ١٣٧٢ گرامەوە لە ساڵی ١٨٠٦دا زیادیکردوە بۆ ١٤٢٤گرام لەم سەردەمەدا. هەروەها ژنانیش لە ١٤٢٤ وە زیادی کردوە بۆ ١٤٦٥گرام.. لەو ساڵانەی دواییدا بەهەمان زیادبوونی پیاوان مێشکی ژنانیش زیادیکردوە.

!.. لای هەموان ئاشکرایە کە گلێنەکانی چاو بەگوێرەی گرنگی دانی مرۆڤ بەکەمێک یا شتێک دەگۆڕێت. بەڵام ئەوەی لای زۆر کەس ئاشکرا نیە، گلێنەکانی چاو گەورە دەبنەوە کاتێک کە مرۆڤ مێشکی زۆر ئیشدەکات.

!.. ئەلیاس هاو چەندین ساڵ هەوڵیدا مەکینەیەکی درومان دروستبکات، تاشەوێک لەخەویدا خەڵکێکی زۆر سەرەتایی گرتوویانەو حوکمی مردنیان

بەسەردا سەپاند ئەگەر مەکینەیەکی درومان لەماوەی ٢٤ سەعاتدا دروست نەکات.. هاو زۆر مێشکی خۆی بەکارهێناو ماندوی کرد بۆ گەڕان بەدوای چارەسەردا، بەڵام بێهودە بوو کاتێك کاتی دیاریکراوی تەواو بوو جەنگاوەرەکان دەورەیان لێداو تیرەکانیان بەرزکردەوە بۆ ئەوەی بیکوژن، لەپڕێکدا هاو لەجێگەیەکەی راپەڕیو رایکرد بۆ تافیگەکەی سەیری کرد هەموو تیرەکان کونێکیان تیایە لەشێوەی چاودا لەنزیك سەرە پانەکراوەکەیەوە، هەستیکرد کێشەکەی چارەسەر بووە، بۆیە توانی مەکینەیەکی درومان دروستبکات کە زۆر بەجوانیو رێکوپێکی ئیشبکات بەمەرجێك کونەکە لەلایەکی دەرزییەکەوە بێت نەك لەسەرو ناوەراستیەوە.

## بڵاوترین نەخۆشی

بڵاوترین نەخۆشی (غیر معدی) کلۆربوونی دانە، ٢٥٪ی دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا توشی دەبن بریتییە لەکلۆربونی ددانەکانیان، زۆر کەمن ئەوانەی بەدرێژایی تەمەنیان توشی دان کلۆربون نابن، بڵاوترین نەخۆشی (معدی)ش نەخۆشی هەڵامەتە.

## دەگمەنترین نەخۆشی

نەخۆشییەکە سروشت نەناسراوە، پێی دەوترێت (کۆرۆ) یان نەخۆشی پێکەنین، هۆزی (فۆد) لەغینیای تازە توشدەبنو نەخۆشییەکی تەواو کوشندەیە، لەئەنجامی خواردنی مێشکی مرۆڤەوە پەیدا دەبێت.

## درێژترین مانەوەی نەخۆشێکی بەشێرپەنجە توشبوو

کەسێك کە توشی نەخۆشی شێرپەنجە هاتبێتو زۆرترین ماوە لەژیاندا مابێتەوە خاتوو (ویناتون میلدریرد)ە کە لەتشرینی یەکەمی ١٨٧٦ لە کالیفۆرنیا لەدایکبوو، چوارنەشتەر گەری شێرپەنجەی بۆ کرا لەساڵەکانی ١٩١٨و ١٩٣٣و ١٩٦٦و ١٩٦٨دا لەساڵی ١٩٧٨دا جەژنی سەدو دوو ساڵەی لەدایکبونی گێڕا.

## درێژترین بێ هۆشی

درێـــژترین بێهۆشــی کــه تۆمــارکرا بێــت (ئــەیلین ئەســبورزیتو) بــوو لەئەنجامی فرێدانی (زائـده)وه توشی بـوو لـه ١٦ ئـاب‌ی ١٠٤١ ئـیتر نەهاتـەوه هـۆش تــا لــه ٢٥ تــشرینی دووەمــی ١٩٧٨دا مــردو لەتەمــەنی ٤٢ ســاڵیدا بەمەرجێك بێهۆشییەکەی ٣٧ ساڵ و ١١١ رۆژی خایاند.

## بیری مرۆڤ

(محەمەد عەلی هلیس) خەڵکی تورکیا لە ١٤ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٧دا تـوانی لـه مـاوەی تـەنیا شـەش سـەعات دا گوێبیـستی ٦٦٦٦ ئایـەت بێـت لـه قورئانی پیرۆز.

## زۆرترین نەشتەرگەری

(شارلنهیل) ١٩١٤ زۆرترین نەشتەرگەری بۆ کـراوه لەجیهانـدا، لـه ٢٠ ئـابی ١٩٧٥دا هەشتاو حەوتەمین نەشتەرگەری بۆ کرا هەمویشی لەسکیدا.

## نەخەوتن

زۆرترین ماوەی بەبێ نەخەوتن گوزەراندبێـتی خاتوو (مورین ویستون)ی ئینگلیزی بوو لەسەر کورسیەکی (هـەزاز) کـه ٤٤٩ سـەعات بـوو واتـه هەشـت رۆژو ١٧ ســەعات، هەرچــەند لەکۆتاییــدا توشــی بێهۆشــی بــوو بــەڵام هــیچ زیانێکی پێ نەگەیشت.

# گەورەترین بەردی لەشی مرۆڤ

گەورەترین بەرد لەمیزەڵداندا دەرهێنرا بێتو هەموو رۆژنامەکانی ئەو سەردەمە لەسەریان نوسیبێت ئەو بەردە بوو لەلاشەی ژنێکی تەمەن ٨٠ ساڵە دکتۆر (همفری ئارسەر) دەریهێنا لەلەندەن کە قورسییەکەی ٦,٢٩١ کگم بوو.

# باوێشك

بەرزترین راپۆرتی پزیشکی لەسەر باوێشك تۆمار کرابێت، لەسەر کچێکی ١٥ ساڵە بوو، لەساڵی ١٨٨٨دا پێنج هەفتە لەسەریەك باوێشکیدا

# بێ جوڵانەوە

زۆرترین کات لەمرۆڤ توانیبێتی بەرەزامەندی خۆی نەجوڵێتەوە (ولیەم فوکوا)ی خەڵکی تکسن بو کە ٦ سەعات و ٣١ دەقیقە بو لەساڵی ١٩٧٨دا.

# مانەوە لەژێر ئاودا

بەرزترین رێکۆردی جیهانی بۆ مانەوە لەژێر ئاودا تۆمارکرابێت ١٣ خولەكو ٤٢,٥ چرکە بوو کە (روبرت فوستر)ی ٣٢ ساڵ بەدەستیهێنا. ٢٠٤,٨سم

جیهان

وه له ژێرئاودا مایەوه لەمەلەوانگەی (رەفایل)ی کالیفۆرنیا له ١٥ ئازار ساڵی ١٩٥٩دا.

## درێژترین ئێسك

ئێسکی رانه که ٢٧،٥٪ی قەدی مرۆڤ پێك دەهێنێت، وا دەچێت ٥٠،٣سم درێژ بێت، لای ئەو کەسانەی که درێژییان ١٨٢سم، درێژترین ئێسکی رانیش هی بالاّ بەرزی ئەڵمانی (کونستانین)ه که دەگاته ٧٥،٧٠سم.

## کورتترین ئێسك

ئێسکی (الرکاب)ه که یەکێکه لەئێسکۆکەکانی گوێی ناوەراست، درێژییەکەی لەنێوان ٢،٦ملم بۆ ٣،٤ملم ه کێشەکەشی لەنێوان ٢،٠ملگرام بۆ ٤،٣ ملگرام دایه.

## هاوڕێیانی مار

لەشاخی جورا فۆردی ناوچەی سەرچاوەکانی (نیل)دا گەلێك دەژین دەتوانرێت پێیان بوترێت هاوڕێیانی مار، چونکه مار دەپەرستن‌و لێی ناترسن، بۆیه مارەکان دەبنه هاوڕێیانی‌و تەنانەت ئەوانەشیان که زۆر ژەهراوی و ترسناکه. سەرەڕای پەرستنی گۆشتەکەی دەخۆن‌و لەوەدا هیچ زیانێك بەدی ناکەن.

ئـەومیان کـە مـارێکی جـۆری (کـۆبرا) بگرێـت لەهـەمویان خۆشـبەخترەو بەراکردن دێتەوە بۆماڵەوە دەیبرژێنێتو دەیخوات، دوای ئەوە هەست دەکات هیچ هێزێك نییە چاری بکات.

## زمانی هیندیە سورەکان

هیندیە سورەکان هەمویان لەکاتی خۆیدا یەك زمانیان هـەبووە بەهـەموو هۆزەکانیانەوە دوای ئەوە لەیەك دورکەوتنەوەو لقو پۆپی تریان لێبومەوە تـا گەیشتەوە ئەوەی لە ئەمەریکای باکورو باشوردا ١٢٥ زمـانی جیاوازیـان هەیـە کە هیچیان لە هیچیان تێناگەن.

## گەورەترین حوکمی لەسێدارەدان

گەورەترین حوکمی لەسێدارەدان ئـەو حوکمـە بـوو کـە فیلیـپ-ی پادشـای ئیسپانیا لەمانگی شوباتی ساڵی ١٥٦٨دا دای بەسەر سێ ملیۆن گیاندا کە ئـەو کاتە هەموو خەڵکی هۆڵەندای دەکرد

# باخچە هەڵواسراوەکانی بابل

باخچە هەڵواسراوەکانی سەمیر ئەمیس-ی بابل لەوڵاتی عێراقدایە، ئەم پاشماوەیە ١٠٠٠ ساڵ پێش زایین دروستکراوە، لەشاری بابل لەلایەن نەبو خوزنەسرە کچی (سیاخار سیکارس)ی پادشای میدیەکان خواستووە، ئەم کچە شازادەیە کە خەڵکی ناوچەی شاخاوی بووەو بەگەرمای بابل ڕانەهاتووە دڵی نەکراوەتەوە، بۆیە نەبوخوزنەسر لەبەرخاتری ئەو ئەو باخچە سەر سوڕهێنەری بۆ دروستکردوە، بەئامێرێکیش ئاوی لەفوراتەوە بردوەتە سەروە بۆ بەرزترین نهۆمی باخچەکە. کە لە زەویەوە ٢٤,٦٠م بەرزبووە نەبوخوزنەسر سامانێکی زۆرێ وڵاتی لەم باخچەیەدا خەرجکردووە دیوارێکی مەزنیشی بۆ دروستکرد لەگرنگترین دروستکراوەکانی (قوللەی بابل)ە کە لەسەرەتادا پەرستگایەکی گەورەبووەو لەشێوەی هەرەمدا دروستکراوە، زۆر کۆن پشتگوێ خرابو، بەڵام نەبوخوزنەسر سەر لە نوێ دروستیکردوە تا گەیاندیە کەشکەشەی ئاسمان، روبەری بنکەی قوللەکە ٩٤,٤٦ مەترو چێوەکەشی ٩٨,٤٠م.. ٨٥ ملیۆن خشت لەدروستکردنیدا بەکارهێنراوە.

# ئەهرامەکانی جیزە لەمیسر

تەنیا سەرسوڕهێنەرێکە لەحەوت سەرسوڕهێنەرەکان کە وەکو خۆی مابێتەوە، گەورەترینیان هەرەمی خۆفۆیە، کە خۆفۆ لە ٢٩٠٠ ساڵ پێش زابین دروستیکردوە (١٠٠٠٠٠) کرێکار ئیشی تێداکردووە، لەماوەی ٣٠ ساڵدا

تەواوکراوە، شوێنی ١٢ فەدانی داگیرکردوەو بەرزییەکەشی ١٤٦ م، چەندین ڕێڕەوی تێدایە لەگەڵ دوو ژوری گەورەو (ژێر زەمینێك)و دوو کون بۆ هەوا گۆڕینەوە.. مێژوی دروستکردنی ئەهرامەکان دەگەرێتەوە بۆ ماوەی ٤٧٥٠ — ٣٠٠٠ ساڵ پێش زایینو ئێستاش ئەو شێوەیەی کە ئەهرامەکانی پێ دروستکراوە لەبڕینی بەردو بەرزکردنەوەیان بەو شێوە ئەندازیارییە جوانەو لەسەریەك دانانیان، هەموو خەڵکی جیهانی سەرسامکردوە، هیچ لەئەو کەرەستانە نەدۆزراوەتەوە کە لەبیناکردنی ئەو ئەهرامانەدا بەکار هێنراون، ژمارەی ئەو کرێکارانەی بۆ کردنەوەی ڕێگا بۆ هێنانی ئەو بەردانە بۆ بیناکردنی ئەهرامەکان ئیشیان کردوە بەسەد هەزار مەزەندە دەکرێت کە دەیان ساڵ ئیشیان تیا کردوە.

## پەرستگەی دیانا

پەرستگەیەکی گەورەیە، بەلام لەسەردەستی کۆمەڵێك پیاوخراپ سوتێنراوە، تەنیا ئەوەندەی لێماوەتەوە کە ئێستا لەمۆزەخانەکاندا دانراوە، پەرستگەی دیانا لەئەفسوس ساڵی ٣٥٦ پێش زایین سوتێنراوە، ئەیوبییەکان چاکیان کردەوەو دەوترێت دروستکردنەکەی ٢٢٠ ساڵی خایاندوە، درێژییەکەی ١٢٢م و پانیەکەی ٦١م، ١٢٧ پایەی تێدایە لەسەر شێوەی ئەیوبی دروستکراوە درێژی هەریەکێکیان ٢٠م، نەیرون جارێکی تر خاپوری کردەوەو دوای ئەویش (قوتیەکان) لەساڵی ٢٦٢ دا جارێکی تر خاپوریان کرد.. پەرستگەی ئەرتیمس لەئەفسوس بۆ خوای ئەرتیمس دروستکراوە لەشاری

ئەفسەرو کە شاریکی گریکی کۆنە لەلیدیای ئاسیای بچوك نزیکی روباری گایستری لەسەر دەریایی ئیجە لەدوری ٥٦,٣٠ کم لەباشوری خۆرهەلاتی ئەزمیری تورکیایە لەسالی ١٠٥٠ پێش زاین دروستکراو، ئەتیمس یەکێك لەخواکانی بووە لەئەفسانەکانی ئەفریقادا کە بەرامبەر لەگەڵ خوای دیانای رۆماندا.. پەرستگەکە بریتیە لەکۆمەڵێك پەرستگە لەو شوێنەدا دروست پاشان سوتێنراوەو جارێکیتر لەشوێنەکەیدا پەرستگەیەکی تازە دروستکراوە کە ئەندازیار ئەسکەندەر (دینوکرات) لەگەڵ پەیکەرتاش (...وکوباس) دروستیان کردۆتەوەو بوو بەیەکێك لەسەر سورهێنەرەکان، تا ئیمپراتۆر (تیۆدۆسیۆس)ی یەکەم لەسالی ٣٩٢ پێش زایین برپاری داخستنی هەموو پەرستگە بتپەرستەیەکانیداو هەموویانی روخاندنو هەندێك لەپایە مەمەرمەر دروستکراوە رەنگ سەوزەکانی برد لەبینایی کڵێسای قەشە صۆفیا بەکاریهێنا کە ئێستا بەمزگەوتی ئەیاصۆفیا بەناوبانگە لەئەستەمبوڵ سالی (٥٣٢ – ٥٣٧) تائێستاش ماوە لەو مزگەوتەدا.

# پەیکەری زەیۆس

پەیکەرێکە چەندین سەدە پێش زایین دروستکراوە جۆرەها بەردی لەخۆگرتووە لەدروستکردنو رازاندنەوەیدا، پەیکەری زەیۆس لەئۆلۆمپیای چیای ئۆلۆمپە کەسێکی یۆنانی بەناوی (فیدیاس) دروستیکردوە، بەرزییەکەی ١٣م، لاشەکەی لەعاج دروستکراوەو عاباکەشی لەزێرە، ئەم

پەیکەرە لەروی جوانیو هونەرەوە لەوێنەی نییە، بنکەی پەیکەرەکە لەبەردی رەش دروستکراوە، بەمشێوەیەی خوارەوە:

پەیکەرتاش (فیدیاس) کە بەناوبانگترین پەیکەرتاشانی گریك دادەنرێت دروستیکردوە لەشاری ئەسینا لە ساڵی ٥٠٠ پێش زایین لەدایکبوەو لێپرسراوی چالاکی هونەری بووە لەئەسینادا لەسەردەمی بدکلیس کە بەسەردەمی ئەسینای زێرین ناودەبرێت ئەم پەیکەرە لەنزیکەی نیوەی سەدەی پێنجەمی پێش زاین دروستکراوە لەعاجو زێڕ زەیوس خوایەکی یۆنانی بوە لەبەرامبەر خوای جوبیتەری رۆمانیەکان، هیچ پاشماوەیەك لەم پەیکەرە نەماوەتەوە تەنیا وێنەکەی لەسەردراو نەبێت، بەگەورەترین پەیکەری یۆنانی دادەنرێت گوایە فیدیاسی پەیکەرتاش نۆ ساڵ ئیشی تێداکردوە. شوێنەکەشی لەسەر شاخی ئۆلۆمپیایە لەناوەراستی ناوچەی (ئەلیانو – ئەلی) لەبەشی رۆژئاوای هەریمی موریا، گوایە شوێنێکی پیرۆزەو هەزاران پەیکەری تر لەوێدا دروستکرابون بۆ خواکانو براوەکانی یارییەکانی ئۆلۆمپی کە لەو شوێنەدا بەرێوەدەچوو.

## گۆڕی هالیکار ناسۆس ( ئاسیا ناوەند )

ئەتمیس لەساڵی ٣٥٤ پێش زایین دروستیکردوە بۆ زیندوراگرتنی یادی (مارسولوس)ی هاوسەری (پادشای کاریافی هالیکار ناسۆس)ی موستەعمەری یۆنانی لەسەر لێوارەکانی دەریایی ئیجە، بەچواردەوریدا بینایەکە ٩٠ م درێژەو ٤٥ م بەرزە، ئەو پەیکەرەی لەسەری بوو تا سەدەی چوارەم مایەوە،

بەڵام لەچەرخەکانی ناوەراستدا تورکەکان تێکیان شکاند، باسێك هەیە گوایە کاتێك (موسول) مرد لەساڵی ٣٥٣ پێش زایین ئارتیمایی خێزانی زۆر غەمی بۆ خواردو ئەو گۆڕەی بۆ کرد لە شاری هالیکارناس-دا وەك یادگارییەك هێندە جوان دروستکراوە تا بوو بەیەکێك لەحەوت سەرسوڕهێنەرەکانی جیهان.. بەرزی گشتی ٤٥,٩٢ مەترو چێوەی بنکەکەشی ١٣٤,٨٠ م بوو، ئەم گۆرە لەنێوان سەدەکانی ١٢ – ١٥ دا روخا، رەنگە روخانی بەهۆی زەمین لەرزەوە بوبێت، کاتێك پیاوانی دۆدوس لەساڵی ١٤٠٤ ی زایینیدا دەستیان گرتە سەر هالیکارناس-دا رێگەیاندا بەخۆیان دەستبگرنەسەر ئەو مەوادانەدا کە گۆرەکەی لێ دروستکراوە بۆ دروستکردنی دیوارێکی بەهێز لەشاری سان بیترۆدا، هەندێکیشیان بەردە ڕوخاوەکانی گواستەوە بۆ مۆزەخانەی بەریتانیا لەساڵی ١٨٤٦ دا، باسێکی تر دەڵێت: زانای بەریتانی سێرشارلز چەند بەشیکی لەم گۆڕە گواستۆتەوە بۆ مۆزەخانەی بەریتانیا لە ساڵی ١٨٥٩دا.

## پەیکەری زۆر بەرزی رۆدس

مێژوی دروستکردنی دەگەرێتەوە بۆ ٢٠٠٠ ساڵ پێش زایین گەورەترین سەد پەیکەری دروستکراو بوو کە لەدورگەی رۆدس دانرابوون بۆ خوای رۆژ وەکو قوربانییەك بۆ ئەپۆلۆ باوەڕیان وا بوو گوایە رۆدس لەپادشای مەکدۆنی دمیتریوس ڕزگارکردوە لەئەنجامی بومەلەرزەیەك لەساڵی ٢٢٤ پێش زایین لەناو چوو.

.......................................................... جیهان

پەیکەرێکی گەورە بوو کە لەبرۆنز دروستکرابوو بۆ خوای رۆژ (هلیوس) لەدورگەی رۆدس-دا لەپاشماوەی ئەو دەستکەوتانەی کە لەشوێن سوپاکەی دمتریۆس بەجێمابون، پەیکەرەکە لەلایەن کەسێکەوە دروستکرا بەناوی (کارس) ماوەی دروستکردنەکەی ١٢ ساڵی خایاندوە. بەرزییەکەی ٤٩,٢٠م و (یان نزیکەی بەرزی پەیکەری ئازادییە لەبەندەری نیویۆرك) لەساڵی ٢٨٠ پێش زایین دروستکراوە لەساڵی ٢٢٤ پێش زایین لەئەنجامی بومەلەرزەیەکدا لەناو چو.

## مەنارەی ئەسکەندەریە

ئەسکەندەریە دوای قاهیرە بەگەورەترین شاری میسر دادەنرێتو دەکەوێتە سەر دەریای سپی ناوەراست، ئەسکەندەری گەورە لەساڵی ٣٣٢ پێش زایین دروستیکردوە لەدێرزەمانەوە بەو مەنارەیە بەناوبانگ بووە بۆیە یەکێك لەحەوت سەرسوڕهێنەرەکانی جیهان، زانکۆیەکی تێدایە لەساڵی ١٩٢٤ دروستکراوە ژمارەی دانیشتوانی ٢,٥٠٠,٠٠٠ کەسە، ئەم ئامارەیە لەبەردی سپی دروستکرەوە، ١٦٤ م لەسەرروی دەریاوە بەرزە ئەو ئاگرەی کە لەسەری دەکرایەوە لەدوری ٥٦ کم دەبینرا.. سەرچاوەکان دەڵێن بەشیکی مەنارەکە لەساڵی ٤٠٠ دوای زایین روخاوە، لەئەنجامی بوومەلەرزەیەکدا بەڵام لەساڵی ١٣٥٧ زاینی بەتەواوی روخاو لەناوچو.

# زمانی ژمارەکان

ژمارەکان زمانێکی سەیرو وردیان هەیە، ئەگەر بەشێوەیەکی تایبەتی ڕێکبخرێت زۆرجار ئەنجامی سەرسوڕهێنەر دەدات، بۆ نمونە: ئەگەر ژمارە ٣٧ لێکدانی ژمارە ٣ بکەیت ئەمجا لەژمارە یەکەوە بۆ ژمارە نۆ هەموجارێك سێ ژمارەی چون یەکت دەستدەکەوێت؟

٣٧ × ٣ × ٢ - ٢٢٢

٣٧ × ٣ × ٣ - ٣٣٣

٣٧ × ٣ × ٤ - ٤٤٤

٣٧ × ٣ × ٥ - ٥٥٥

٣٧ × ٣ × ٦ - ٦٦٦

٣٧ × ٣ × ٧ - ٧٧٧

٣٧ × ٣ × ٨ - ٨٨٨

٣٧ × ٣ × ٩ - ٩٩٩

.. زانایەکی ئەڵمانی ساڵی ١٩٢٨ پێشبینی ئەگەری هێرشکردنە سەر بەندەری بیرڵ هاربەری ئەمریکی کردو پێشبینیەگەی راست دەرچوو، هێرشکردنە سەر ئەو بەندەرەش هۆی چونە ناوی ئەمەریکا بوو بۆ جەنگی جیهانی دووەم.

.. وەچەکانی مانگای وەحشی لەئەمەریکا خەریکە لەناو دەچن، تەنیا ٤٠٠٠ دانەی لێماوە لەکاتێکدا لەساڵی ١٨٧٢دا ١٢٥,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن بوون روبەری کیشوەری ئاسیا ١٦,٤٩٤,٠٠٠ میل دوجایە.

.. ئەوروپا بچوکترین کیشوەرە لەدوای ئوستورالیا، بەڵام زۆرترین وڵاتی تیدایە

.. لەکۆندا وا باو بووە باڵیۆز نەیتوانیوە ژنەکەی لەگەڵ خۆیدا بەرێت بۆ ئەو وڵاتەی بۆی نێردراوە، لەترسی ئەوەی نەوەك نهێنیەکانی وڵات بۆ دوژمنان ئاشکرا بکات، بەڵام بۆی هەبووە خزمەتکارێك لەگەڵ خۆیدا ببات، نەوەك خزمەتکاری وڵاتەکەی تر ژەهر بکاتە ناو خواردنەکەیەوە.

.. لەسەردەمی ناپلیۆنی سێهەمدا بەفەرەنسا دەوترا ئیمپراتۆریەتی فالس، چونکە فەرەنسیەکان زۆر خەریکی دەستبازیو رابواردن بوون.

٭.. لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا روسیاو بەریتانیاو فەرەنسا لەنێوانی خۆیاندا، پەیمانێکی نهێنیان بەست بۆ دابەشکردنی رۆژهەلاتی ناوەراست، بەلام رێکەوتنەکەیان سەری نەگرت لەبەرئەوەی روسیا نهێنییەکەی ئاشکرا کرد.

٭.. یەکێك لەئارەزومەندانی کەشتیوانی لەهەموو پێشبرکێیەکی جیهانیدا بەشداری دەکردو هەموجارێکیش شکستی دەهێنا، تاگەیشتە ئەوەی لیژنەی رێکخستن پێشبرکێی میدالیای حەزترین سەرنەکەوتوی جیهانیان دایە.

٭.. شوشە داهێنانێکی رۆژهەلاتییەو لەماوەی جەنگەکانی خاچپەرستاندا گوازراوەتەوە بۆ ئەوروپا.

٭.. جۆرەکانی کیسەلّ دەگاتە ٢٠٠ جۆر چەند رێژەشی زیاتر بێت ئەستێرەکان لەشەودا زیاتر دەبریسکێنەوە.

٭.. مێشولە لەشەش میل زیاتر لەکونەکەی خۆی دورناکەوێتەوە مەگەر بابیبات.

٭.. ئاوی بنی دەریاکان زۆر ساردن تەنانەت لەناوچەی ئیستیوائیکانیشدا.

.. باشترین خواردن لای ئوستورالیەکان ئەوەیە کە کلکی کەنگەری تیدا بێت.

.. شاعیری گەورەی ئینگلیز نیتون ئەریتێکی زۆر سەیری هەبوو لەجگەرەکێشاندا کاتێك دەچووە نوسینگەی دانەدەنیشت تاوەکو خزمەتکارەکەی سندوقێکی توتن و سندوقێك سەبیل و سندوقێکی بەتاڵی بۆ دەهێنا، ل توتنەکەی دەکردە سەبیلە بەتاڵەکەوەو دەیکێشا تا تەواو دەبو پاشان سەبیلەکەی دەشکاندو دەیخستە سندوقە بەتاڵەکەوە بەمجۆرە هەتا هەموو توتنەکەی تەواو دەکرد.

.. زۆربەی ئەو ماسیانەی لە ئاوی زۆر قوڵدا دەژین کوێرن، لەساڵی ١٦٢٤دا فودنداری ئەڵمانی کە لەبەریتانیادا دەژی هەوڵیدا رێگەیەك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی کەشتیەکان بتوان بەژێر ئاودا بڕۆن، بەڵام تیایدا سەرنەکەوتن تا پیاوێکی ئەمریکی بەناوی (بۆشنال)، ئەو تاقیکردنەوە سەرنەکەوتوەی (دار یاهل)ی تەواوکردو توانی لەساڵی ١٧٧٢ دا یەکەمین ژێر دەریایی (غواصە) دروستبکات و بەدیاری بینێرێت بۆ ناپلیۆن لەساڵی ١٨٠٠م دا بەڵام لەیەکەم تاقیکردنەوەدا ژێر ئاو•کەوت.

.. ئەسپ دەتوانێت بۆ ماوەی چەند مانگێك هەردوو دەستی بەرزکاتەوەو لەسەر هەردوو قاچی بوەستێت.

؟.. ئەو گەردیلە هەواییانەی کە هەڵی دەمژین لەگەردوندا بەخێرایی گوللە تفەنگ دەجولێتەوە، ئەگەر سێ ملیۆن هەڵمژین ئەمجا توانیومانە یەك ملیمەتر هەوا هەڵمژین.

؟..مێژوی تۆپی پێ دەگەرێتەوە بۆ سێ هەزار ساڵ پێش زایین (چین)یەکان لەپێش ولآتانی تردا ئەم یارییەیان زانیوە، دادوەرەکان پارەیانداوە دۆڕاوەکانیشیان دارکاریکردوە.

؟.. لەنیمچە دورگەی عەرەبدا دارێك هەیە کە بەرێك دەگرێت بریتیسە لەسێ دانەی رەش هەر یەکەو بەئەندازەی فاسۆلیاکە، بەناوبانگە بەداری پێکەنین، هاراوەی دەنکەکانی بۆ پرتو پژمین بەکاردێت، ئەگەر کەسێك چەندجار هەڵی مژێت توشی پێکەنین دەبێت وازی لێ ناهێنێت تالێی دەکاتە سرکردن کە نزیکەی نیو سەعاتێك دەخایەنێت، پاشان خەوێکی قوڵی لێدەکەوێت.

؟.. لەژێری زەریای ئارامدا زنجیرە شاخێك هەیە لەزنجیرەی چیاکانی هیمالایا بەناوبانگو بەرزترە.

؟.. پیاوێکی ئاسایی بەدرێژی بیست هەزار هەنگاو دەبڕێت لەرۆژێکدا، کە دەگاتە نیو ملیار هەنگاو لەهەشتا ساڵدا. ئەمەش بەسە بۆ سوڕانەوە بەدەوری جیهاندا شەش جار.

## سەیرو سەمەرەکانی....................................

!.. کێشانی جگەرەیەکی ئاسایی چوار ملیۆن لەش لەخۆڵەمێش لەهەوادا بڵاودەکاتەوە.

!.. ماسولکەکانی کاجیرەی مرۆڤ لەبەهێزترین جۆری ماسولکەکان دادەنرێت کە ژمارە یان ٦٣٩ جۆرەو دەتوانێت ١٢٠ کیلۆگرام هەڵبگرێت بێ ئەوەی خۆی ماندو بکات..

!.. بەرخ بەکۆنترین گیانلەبەری ماڵ دادەنرێت، وەك لەتەوراتدا هاتوە کوڕی ئادەم شوانی بەرخ بووە.

!.. ئەگەر کەسێك بەپێوە بوەستێت بالاّی کورتترە وەکو لەوەی خەوتبێت، مرۆڤ کاتێك رادەکێشێت برێك ئاو دێتە ناو برِبرِەی پشتییەوەو نەختێك درێژ تری دەکات.

!.. زانای بەناوبانگ ئەرخەمیدس زیاتر لەهەزار ساڵ لەمەوبەر خۆری بەکارهێناوە بۆ سوتاندنی پاپۆڕی رۆمانیەکانی دوژمنی وڵاتەکەی (سیراکوزا). بەشکاندنەوەیەکی بەهێزی خۆرەوە بەهۆی ئاوێنەی قەبارە گەورەی قوپاوەو (معقر) کە گڕی تێبەردەدا.

!.. لەویلاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادا لەگۆڕەپانی لاتل کاپیتون پەیکەری مریشکێك بەسەر هێلکەوە دروستکراوە لەماددەی بیرۆنز کە پێنج

ئەوەنــدەی مریــشکێکی گەورەیــە، وەك سوپاســگوزاری بــۆ ئــەو خزمەتــەی مریشك بەخواردنی هاولاّتیان دەیکات.

لەو لاشیەوە پەیکەری پیاوێك كراوە كە بە (فیلیكوس كورن) ناسراوە وەكو مێژوو باسیدەكات یەكەم كەس بووە سێوی خواردوە، پێش ئەو مێژووە باوەڕ وابووە كە سێو میوەیەكی ژەهراویە.

.. مێـشكی مـرۆڤ كـە بریتییـە لـەدوانزە ملیـۆن خانـە زاڵـە بەسـەر ماسولكەو دەمارو هەموو ئەندامەكانی لەشدا.

.. مێشكی مرۆڤ كێشی لە نێوان ٩٦٧و ١٣٨٤ گرام دایە.

.. واك كارجێك كە ڕێزمانی عەرەبی بـۆ یوغـسلافیە تازەكـان دانـاوە لـە ژیانیدا نەچۆتە قوتابخانە.

.. تەماتە كاتێك لەكۆتایی سەدەی شانزەهەمدا چووە ئـەوروپاوە پێیـان دەوت (سێوی خۆشەویستی).

.. تاقیكردنـەوەكان سـەلماندویانە گـوێی راسـت لـەگوێی چـەپ بەگـشتی لەبیستن بەهێزترە؟

.. مێروی مۆرانە سـالأنە لەسەرانـسەری جیهانـدا بـەهای سێـسەد ملیـۆن دۆلار جلوبەرگ دەكات.

## سەیرو سەمەرەکانی...............................

ؤ.. لەهیندستان جۆرێك لەباڵندەی بچوك هەیە ناوی (هێ نینا)یە لە توتی باراو قسەدەکات.

ؤ.. هەر دڵۆپێك باران لەدروستبوونیدا پێویستی بەگەردیلەیەك لەخۆڵ یان خوێ یان هەر تەنێکی تری ڕەق هەیە.

ؤ.. هەندێ جار باران دەبارێت بەڵام نایبینین لەبەرئەوەی لەهاتنە خوارەوەیدا پێش ئەوەی بگاتە زەوی دەبێتە هەڵم.

ؤ.. پەیمانگای لێکۆڵینەوەی زانستی لەکامبورج سەلماندویەتی کە مێشولەش حەزیان لەرەنگ هەیەو بەدەوری رەنگە سورو زەردەکان کۆدەبنەوە، بەڵام رقیان لەرەنگی شین دەبێتەوە، جوانترین رەنگ بەلایانەوە رەنگی سپیو سەوزی کاڵ (کراومیە).

ؤ.. یەکێك لە ئەندامی کۆمەڵەی کەشزانی لەبەریتانیا کتێبێکی نوسیووە بەناونیشانی (ئازارو باران) تیایدا دەڵێت ٤,٥٠٠ حاڵەتی دیوە لەمرۆڤدا کە پێش باران بارین هەست بەئازار دەکەن ئەمەش ئەوە دەردەخات ئەو ئازارە کوتوپڕە پەیوەندی بەنزیکی باران بارینەوە هەیە.

خەڵکی باوەڕیان وایە کە نهێنی باران بارین لەوەدایە کە فریشتەکان لە کەنداوی بانجرك-دا خۆیان دەشۆن لەبەر ئەوە باران دەبارێتە سەر خەڵکیدا.

## جیهان

⚠.. کەشناسەکان ئەوە رادەگەیەنن کە رێژەی باران بارین لەسەرانسەری جیهاندا لەپەنجا ساڵی دوایدا بەرێژەی ١٪ کەم بۆتەوە، هەندێك لەزانایان لایان وایە ئەم کەمبونەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چەورییەی کە کەشتییەکان دەیرێژنە سەر ئاوی دەریاکانو دەبێتە هۆی نەگەیشتنی خۆر بۆ ئاوەکەو کەم هەڵمکردنی ئەو ئاوە کە یەکەم هۆیە لەدروستکردنی بێ بارانییدا.

⚠.. یەکێك لەزانایانی جوانی راپۆرتێکی پێشکەشکرد تیایدا دەڵێت باشترین هۆی جوانکردنەوەی دەموچاو ئاوی بارانە.

# بەشی سێیەم

# سەیرو
# سەمەرەکانی داهێنان

⁂.. پیاوێکی ئەمریکی کە لەکارگەی چاویلکەسازیدا ئیش دەکات چاویلکەیەکی دروستکردوە لەکاتی دەموچاو شتندا چاو لەکەف سابون دەپارێزێت.

⁂.. فسلیپ بیچ ی کەتەدی چنگاڵێکی دروستکردوە لەکاتی خواردنی ماکرۆنەدا ماکرۆنەکە لول دەخواتە دەوری چنگاڵەکە، ئیتر بەوجۆرە ناکەوێتە خوارەوە.

⁂.. دکتۆر (ج. ی. کوری) لەنیویۆرك توانی لەپاشماوەی قامیشی شەکر دوای تێکەڵکردنی لەگەڵ ماددەی کیمیاوی نوێدا، ماددەیەکی تازەی دەست بکەوێت کە لە تام و بۆن‌وشێوەدا لەدوکەڵی جگەرە بچێت.

⁂.. (هێرمان ولف)ی ئەندازیار توانی ئامێرێك دروست بکات تیشکێکی لێوە دەربچێت لە دوری ۱۰ مەترەوە هەرچی مێشوولە لەو دەوروبەرەدا بێت بیکوژێت.

⁂.. زانایەکی فەرەنسی توانی ئامێرێك دروست بکات بۆ کپکردنەوەی دەنگی ماتۆڕی ئۆتۆمبیل کە شۆفێرو سەرنشینانانی ناو ئۆتۆمبیلەکە نەیبیستن. بەلاَم شۆفێرەکانی تر دەیبیستن بۆ ئەوەی بزانن ئۆتۆمبیلەکە لەپێشیانەوەیە یان لەدواوەیە.

ا    رەھەم داهێنەری ساندەویچ ئێر ساندەویژە کە لەساڵی ١٧١٨ لەدایك بووەو یەکەمین داهێنانی هەمبەرگر ساڵی ١٨٧٢ بووە لەکاتێکدا تەمەنی لەدایکبونی شەستو پێنج ساڵەی خۆی گێڕا.

# پێڕست

## سوپاس و پێزانین

زۆر سوپاس و پێزانینم بۆ:

- ئەکرەم ئیبراهیم
- ئارام رەشید
- شێرکۆ جەوهەر

کە لەکاتی نوسینەوەی دەستنوسی ئەم کتێبەدا هاوکاری زۆریانکردم، دوبارە سوپاس و هیوای سەرکەوتنیان بۆ دەخوازم

وەرگێڕ

